# مەسەلەی کوردستان
# لە نێوان ململانێی تورك و ئینگلیزدا

سەرەتایەك بۆ داگیرکردن.

## سەلام ناوخۆش

# مەسەلەی کوردستان
# لەنێوان ململانێی تورک و ئینگلیزدا

-سەرەتایەك بۆ داگیرکردن-

سەلام ناوخۆش

## پێشەکی

لەبەرایی سەدەی بیستدا، کۆلۆنیالیزم شێوازێکی تری وەرگرت . ئەگەر ماهیەتی مەسەلەکەش هەروەك خۆی مابەوە، ئەسلی بابەت هەر داگیر کردن و برسی‌کردن وقڕکردن بوو، بەلام بەرایی چەرخەکە وای دەخواست مەسەلەی دبلۆماسی لە مەسەلەی عەسکەری فەرتربێ. ئیمپریالیزمی رۆژ ئاوا هەر چۆنێ بێ هەرچ بکا دەرهەق گەلانی رۆژهەلاتی دین و کەلتورجیا ئاسایی،بەلام دروست بوونی رۆحی‌ئیمپریالی لەنێوان گەلانی دراوسێ و هاودین و هاومێژوو مەسەلەیەکە وەستانی دەوێ. جەنگی یەکەمی جیهان بەهەربیانوو و پاساوێبێ،جەنگێکی ئیمپریالی بوو، گەلانی رۆژ هەلات بەگشتی وکورد بەتایبەتی باجەگەورەکەی دا. لەپاش روخانی دەسەلاتی عەلانی ئیتحادیەکانی عوسمانی، لەنێوان سەرانی کەمالی و ئینگلیز ململانێی هاتە کایەوە. وەنەبێ ململانێیەکە دینی، شارستانی یان فکری بێ. بەلکو خودی ململانێ یەکە لەپێناو رەگ داکوتانی"دەسەلاتێکی نوی" بوو.بەهیچ جۆرێ ململانێ یەکی " قەومیش " لەنێوانیان لەئارا نەبوو، ئەگەر نا ئەدەبوو تورك پشت لەمەسەلەی پان تورکیزم بکەن واز لەزۆر شوێنی تورك نشین لەئاسیاو ئەورووپا بکەن و بەواتا یەکی تر، خودی ململانێ یەکە هاوکاریەکی رۆحی و ماددی هەردوو عەقلیەتی نوێی تورکی وئینگلیزبوو لەپێنا وڕەگ داکوتانی ئیمپریالیزم بەحوکمی ئەوەی ولاتی کورد لەنێوان قەلەمڕەوی هەردوو دەسەلاتدابوو، بۆ یەهەردوو لا وەیانکرد کورد باجێکی چارەنوسسازبدات: ئەویش ولاتەکە" بەرەسمی" بەزەبری" شەرعیەتی دەولی" داگیر بکرێتو وا بەشبکرێ.

ئەم کورتە لێکۆلینەوە لە سێ بەشی سەرەکی پێکدێ:

<u>بەشی یەکەم:</u>

تایبەتە بە رێکەوتنامەی سایکس بیکۆو پەیمانی سیڤەر و لۆزان وکاریگەری هەریەکە یان لەسەر رەوشی دۆزی کوردستان ـ وەك ولاتێك ـ لەناوچەکەدا.[1]

<u>بەشی دووەم:</u>

---

[1] ئەم بەشە لەنامیلکەی لۆزانی ١٩٢٣ و لۆزانی ١٩٩٠ دەرهێنراوە.

لەمەسەلەی هاتن وستراتیژیەتی میجەرنوئیل لەکوردستان دەکولیتەوەو هەول دەدات ئەوە دەربـی کەمەبەستی سەرەکی ئینگلیز لەناردنی نوئیل بۆکوردستان بۆبەرژەوەندی کورد نەبووە.

بەشی سی یەم:

لە کەسایەتی و ستراتیژی نۆزدەمیر دەکۆلیتەوە، ئەوە دەردەخا نۆزدەمیرخەریکی بە تورکی کردنی باشوری کوردستان بووە.[2]

لەکۆتایی کورتە نووسینیکمان بلاو کردۆتەوە بەناوی:

( پیش ئەوەی ئینگلیز دەولەتی عیراق دامەزرینی حکومەتیکی کوردی لەسلیمانی دامەزراند) [3]

هەر بۆئەوەی بسەلمینین کە ئینگلیز چاك دەیزانی باشوری کوردستان بەشیك نیە لە عیراق هەر خۆی بەرەسمی دانی بە دەسەلاتی حکومەتی خواروی کوردستان بە سەرۆکایەتی شیخ محمود ناوە بەلام ئەم حکومەتە بەهۆی سیاسەتی داگیر کەرانەی ئینگلیز و تورك لەلایەك وعەقلیەتی سیاسی کوردی ئەوسا لە لایەکی‌ترنسکۆی هینا و کورد و کوردستانی باشور مۆرکی" عیراقچیتی" یان پیوە لکیندرا!

سەلام ناوخۆش

٢٠٠١\٨\١٥

---

[2] \ بەشی دووەم و سی یەم لەژمارە (١١)و(١٢) ی گۆڤاری دەھۆك بلاوبۆتەوە.

[3] \ ئەم نووسینە لەژمارە (٣١٦٢) ی ٢٢\ ١٨ ٢٠٠٠ رۆژنامەی برایەتی بلاوکراوەتەوە .

## لە پەیمانی سایکس بیکۆوە بۆ
## کۆنگرەی ئاشتی پاریس

لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی دا کوردستان بەبێ ویستی کورد ببوە جەرگەی پێکدادانی هێزەکانی روسیاو ئینگلیزو عوسمانی ئەم شەڕە ئاکامی ئەو ململانێ قووڵەی دەسەلاتی عەسکەری و جیاوازی شارستانی بوو، رۆژ ئاوا بەهەردوو کامپی شەرقیو غەربی دەیەویست کۆتایی بەبوونی دەوڵەتی عوسمانی بێنێ.

ئینگلیزو فەرەنسا لەم شەڕەدا لەڕواڵەتدا هاوستراتیژ بوون دەیانە ویست هەریەکە بەشێکی ئەو دەوڵەتەی بەرکەوێ، بۆ مەیسەر بوونی ئەو پرۆسەیەش لە رێگای مسیۆنێرو گەشتیارەکانیاندا پێشتر خەریکی داگیر کردنێکی فکری و ئانەوەی ئاژاوە بوون، هەرچی رووسیا بوو ئەوا بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم چەندەها جار شەری عەسکەری گەورەی لەدژی عوسمانییەکان سازدا بوو، هەروەها بەحوکمی هاو سنووری بوون لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دا ئەوا توانی بووی هەتا پێگەیەکی فکریو دینی و عەسکەری لەسەر سنوورەکان لەنێوگەلانی ناو ئەمپراتۆریەت بەتایبەت ئەرمەن و کورد بۆ خۆی دروست بکات.

بۆ یە ململانێی دینی لەنێوان روسیاو دەوڵەتی عوسمانی تارادەیەک چوارچێوەیەکی ململانێکەی بەخۆوە گرت بوو، هەرچی ئەلمانیا بوو ئەوا هەرچەند لەڕواڵەت هاوپەیمانی دەوڵەتی عوسمانی بوو - ئەگەر لەجەنگ سەرکەوت با ئەوا داگیر کردنی هەموو دەوڵەتی عوسمانی یەکێ لە ئارمانجانە ستراتیژیەکانی بوو -- نەوت یەکێ لەو ئارمانجانە

بوو کە ئەلمانیای پەلکێش کردبوو بیر لەدەست بەسەرا گرتنی دەوڵەتی عوسمانی بکاتەوە.

ئەمەو دەوڵەتی عوسمانیش لەپاش کودەتای تەموزی ١٩٠٨ بەتەواوی ستراتیری ئیسلامی خۆی لەدەست دابوو، دەوڵەت هەر بەناو ئیسلامی بوو چونکە گروپی دەسەلاتداری ئیتحادو تەرەقی نەك هەرئیسلامی نەبوون بەڵکو گروپێکی ماسۆنی بوون تەواو لەرازەی یەهوودیەتی جیهانی دابوون بۆیە بە ((بەعەلمانی بوونی دەوڵەتی))و چەوساندنەوەی گەلانی ناو ئەمپراتۆریەت موسڵمان یان غەیرە موسڵمان کارنگەرێکی زۆر گرنگی هەبوو لەسەر حەتمیەتی بەزینی دەوڵەت لەبەرامبەر هاو پەیمانەکان، هاوپەیمانە کانیش هەرکە گەیشتنە یەقین کە هەرەسی دەوڵەتی عوسمانی مسۆگەر بووە، ئەوا لەزۆر کەنالەوە پەیوەندی‌یان بەگەلانی ناو ئەمپراتۆریەت وەك عەرەب و کوردو ئەرمەنی کرد، ئەو بەڵێنانەش هەرتەنها بۆ زووتر مەیسەر بوونی داگیر کردن بوونەك ئەنجامدانی بەڵێنەکان بێ، ئاشکرا بوونی دەقی رێککەوتنامەی سایکس بیکۆ لەپاش سەر کەوتنی کودەتای رووس لە ١٩١٧/١١/٧ (١) ناسراو بە شۆرش ئۆکتۆبەر زێتر ماهیەتی داگیر کارانەی ئینگلیز و فەرەنسا و روسیا لەبەرامبەر گەلانی ناو ئەمپراتریەتی عوسمانی دەردەخەن.

## ڕێككەوتننامەی سایكس بیكۆ یاخود ڕێككەوتننامەی سایكس - بیكۆ - سازا نۆف؟!

ئەو ڕێكەوتنامەیە سەرەتا بیرۆكەیەكی بەریتانی - فەرەنسی بوو، هێشتا جەنگی یەكەمی جیهان لەگەرمەی بوو، بەریتانیاو فەرەنسا لەرێگەی سایكس و بیكۆ مژۆڵی دارشتنی نەخشەی دوای روخانی دەولەتی عوسمانی بوون، هەردوولا لەمایسی ١٩١٦ لەسەر هەندێ بنەمای سەرەكی دابەش كردنی دەوڵەتی عوسمانی ڕێككەوتن، بەلام بەحوكمی ئەوەی رووسیا دەورێكی زۆر سەرەكی هەبوو ئەوسا هەروەها بەحوكمی ئەوەی هەندێ ناوچەی دەولەتی عوسمانی لەژێر دەستی رووسیا بوو هەروەها ڕووسیا دەگەڵ ئەرمەن و كورد جۆرە هاوپەیمانییەكی هەبوو هەروەها رووسیا دوژمنی سەرسەختی دەوڵەتی عوسمانی بوو لە هەمووش گرنگتر ڕووسیا چاوی بڕی بووە بەشی باكوری كوردستان، ئەو ناوچەیەش بۆ داگیر كردن سەبارەت بەڕووسیا ساناتر بوو بۆ ئینگلیز و فەرەنسا، بۆیە هەردوولا بیریان لەوە كردەوە كە ڕووسیاش بكەنە هاوپەیمانی خۆیان لەوپرۆژە ئیستعماریەدا ، سازانۆف وەزیری دەرەوەی ئەوسا ڕووسیا هاوشانی سایكس و بیكۆ بوو، سازانۆف تەواو دیراسەی پرۆژەكەی كرد ئینجا لە نیسانی ١٩١٦ رەزامەندی و لاتەكەی لەسەر پرۆژەكە بەم مەرجانە ڕاگەیاند:

١. پێویستە ناوچەی ئەرزە رۆم ترابزۆن و وان و بەدلیس هەتا ئەو شوێنەی دەکەوێتە رۆژ ئاوای ترابزۆن لەسەر کەناری دەریای رەش هەمووی بۆ رووسیا دابنرێت.

٢. ئەبێ ناوچەی کوردستان لە باشوری وان و بدلیس دا، لە نێوانی موش و سعرت و روباری دجلە و جزیرەی ابن عمر، هێڵی لوتکەی ئەو شاخانەی بەسەر عمادیە دا دەڕوانن لەگەڵ مەرگەروەڕ، هەموو بۆ رووسیا تەرخان بکرێ و روسیاش بەرامبەر بەمانە دان بەوەدا ئەنێت ئەو ناوچانەی کەوتوونەتە نێوان ( ئالە داخ - قیصری - خربوط) هەمووی بۆ فرەنسابێ

٣. روسیا بەوپەڕی توندو تیژیەوە بەرامبەر هەر هەوڵێکی فرەنسا دەوەستێت وپێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کەنابێ هیچ بەشێك لە کوردستان ، بەتایبەتی خۆرئاوای تورکیا بدرێت بەفەرەنسە [٢] ، پاش ئەوەی هەرسێ لا سایکس - بیکۆ - سازانۆف لەسەر پرۆژەکە رازی بوون ئەوا لەئەیلوولی ١٩١٦ پرۆژەکە شەکلێکی رەسمی وەرگرت، هەر دەوڵەتەو بەشێك لەخاکی ئیمپراتۆریەتی بۆ خۆ دانا بوو، بەرەنگێکی جیاواز ، وەك سنورێك، لەواتی تر جیا دەکردەوە،[٣] بەم شێوەیە ئەو شوێنەی لەسەر نەخشەکە رەنگی سووری بۆ دانرا بوو، ئەوا شوێنی دەسەڵاتی ئینگلیزی دەگەیاند، کە بەشێوەیەکی سەرەکی بریتی بوو لە دۆڵی رافیدەین: ئەو ناوچەیە لە خانەقینی باشوری کوردستان درێژ دەبێتەوە بەرەو سەرەوە تاکو باشوری کوێت [٤]، ناوچەی دەسەڵاتی فەرەنسیش بە

رەنگی شین دیار کرابوو ئەویش بەشێوەیەکی سەرەکی ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کەئێستا پێی دەڵێن سوریاو لوبنان[٥] هەروەها ویلایەتی موسڵ - خواروی کوردستان ، هەروەها باکوری کوردستان (کەلەپەیمانی سایکس - بیکۆدا بەکوردستانی مەرکزی ژوورو ناوبراوە) بۆ روسیای قەیسەری دانرابوو[٦]، ناو چەیەکیش کەبەرەنگی سەوز بۆیە کرابوو ئەوا بۆ ئیتالیا دانرابوو[٧]

ڕووداوەکانی دوای ئیمزاکردنی پەیمانی سایکس بیکۆ - سازانۆف و هەروەها هەرەس هێنانی دەوڵەتی عوسمانی چارەنووسی کوردستانی بەئاقارێك دابرد هەرهەمووی لەبەرژەوەندی بەریتانیا دابوو.

لەلایەك روسیای قەیسەری لەئاکامی کودەتای ئۆکتۆبەر هەرەسی هێناو سوپای رووسی بەرێککەوتنامەی سنوری و هەروەها پەیمانی لیتۆفسك ولزی لەباکوری کوردستان هێناو هەتا لەپەیمانەکەشی پەشیمان بۆوە، مستەفا کەمال بەپاڵپشتی ئینگلیزەکان توانی ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوە ناوچەکە بیخێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، لەلایەکی تریش بەحوکمی ئەوەی ئینگلیز تەواوی عێراق و بەشێکی زۆری خوارووی کوردستانی لە ڕووی عەسکەری یەوە داگیر کردبوو، دەشی زانی نەوت لەوناچەیە هەیە، بۆیە توانی فەرەنسا رازی بکات دەست بەرداری خوارووی کوردستان بێ، لەپاش ئەو ڕووداوانە، ئینگلیز بەسوود وەرگرتن لە بەیاننامەی لوید جۆرج و کلیمانسۆ و ویدرۆ ولسن بەتایبەتی بەندی دوازدەی چواردە بەندەکەی ویلسن لەگەڵ هاوپەیمانەکان جاری کۆنگرەیەکی ئاشتییان دا لە پاریس ، ئەو کۆنگرەیە خۆی لەخۆیدا

بریتیبوو له بەشەرعی کردنی پەیمانی سایکس بیکۆ، له روالەت داوا لەکورد و عەرەب و ئەرمەن و ئاشوری کرا کەبەشداری ئەو کۆنگرەیە بن، لەو نێوە تەنها کورد هەلوێستی باشی نەبوو، چونکە زۆربەی عەشیرەتەکان لەژێر راسپاردەی ئیتحادیەکان شەڕی هاوپەیمانەکانیان کردبوو، هەرچی ئەرمەن و ئاشوری بوون ئەوا دوو هێزی هاوپەیمانی هاوپەیمانەکان بوون، هەریەك لەم دوو گەلە هەریەکەی بەجۆرێ داگیر کردنی کوردستانی بەشەرعی دەزانی ئەرمەنەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە باکوری کوردستان زێدی ئەوانە بە جۆرێك هەتا بە گوێرەی بەندی ٨٨ی پەیمانی سیڤەر بەشێك لەخاکی کوردستان بۆ ئەرمەنەکان دانرابوو ئەو شوێنانەی وەك وان، بدلیس تەرابزۆن ئەرزە رۆم کەکاتی سایکس بیکۆ روسیا داوای دەکرد، ئەوا بەشەرعی بۆ ئەرمەنەکان دانرابوو.

مەسەلەی بە ئەرمەنی کردنی کوردستان مێژوویەکی لەمە کۆنتری هەیە بەجۆرێ رۆناکبیرێکی وەك حاجی قادری کۆیی خۆی لەبەردەم ئەم هەرەشە پێ رانەگیراوە بۆیە هاواری سەرانی کوردی کردووە:

خاکی جزیرەو بۆتان یانی ولاتی کوردان
سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بەئەرمەنستان
هیچ غیرەت نەماوە، سەد جار قەسەم بەقورئان
پەیدا بێ ئەرمەنستان نامێنی یەك لە کوردان [٨]

ئەمەو بەندی (١٦)ی پەیمانی سان ستیڤانۆو بەندی (٦١)ی بەرلین دووبەلگەی حاشا هەلنەگرن لەسەر بەئەرمەنی کردنی کوردستان ،هەر

لەو بارەوە جەمال نەبەز دەڵێ: لەنێوان ١٩١٥ - ١٩١٨ لەرۆژهەڵاتی تورکیا نزیکەی (٧٠٠) هەزار کورد بەدەستی ئەرمەن کوژراوە، تەنانەت لەساڵی ١٩١٦ کاتێك سوپای ڕوسی لە ناوچەی حاجی ئۆمەران و باڵەکاتی‌یەوە بەرەو ڕواندوز هاتن، چوار فەوجی ئەرمەنی‌و فەوجێکی ئەستوریان لەگەڵ بوو، ڕۆژی ١٢ی مایس ئەم هێزانە شاری ڕواندزیان داگیر کرد، ئەرمەنەکان بەبەرچاوی ڕوسەکانەوە کەوتنەوە گیانی دانیشتوانی ڕاوندوز لەئەنجامدا نزیکەی (٥) هەزار پیاو ئافرەت و منداڵ بوونە قوربانی، گوایە زۆر بەیان بە گوللە نەکوژراون، بەڵکو فڕێدراونەتە گەلی (فەرمند)ی ڕواندز، لەنزیکەی (٢٠) هەزار خانووبەری ناوشار تەنها (٢٠) ماڵ بەسەلامەتی دەرچووە [٩] ئەو هەڵوێستە توندەی ئەرمەن دەرهەق بەکوردان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وەهمەی ئەرمەن کە بەشێکی کوردستان لە ئەصڵدا خاکی ئەوانەو بەزۆری بەئیسلام و کورد کراوە هەروەها هەریەك لەروسیاو بەریتانیا دەورێکی زۆر گرنگیان بینی لەدروست کردنی وەهمی ئەرمەنستانی گەورە لەسەر خاکی کوردستان[١٠]، بەحوکمی ئەوەی ئەرمەن دەگەڵ هاوپەیمانەکان بوو، کوردیش دەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بوو، هەر کەجەنگیش بەبەرژەوەندی هاوپەیمانەکان تەواو بوو، ئەرمەن سورتر بوون لەسەر بەناوی ماڵی مێژووی یان بەسەر کوردستانەوە.

شەریف پاشای نوێنەری کوردان بۆ کۆنگرەی ئاشتی پاریس خۆی لە بۆ گۆس نۆباری ئەرمەن بۆ کۆنگرەی ناوبراو نزیك کردەوە هەردوولا لەئاکام ڕێککەوتن کەهەر یەك لەئەرمەنستان و کوردستان لەیەك جیا بن

،هەروەها پێکەوە یاداشتێکیان لەیەکی ئاداری ۱۹۱۹ ئاراستەی ئەنجومەنیبالآی هاوپەیمانەکان کرد، هەروەها بەحوکمی ئەوەی هەڵوێستی کوردان لە بەرامبەر هاوپەیمانەکان لاواز بوو، بۆیە نوێنەری کورد دوو یاداشت و نەخشەی لە ۱۹۱۹/۳/۲۲ و ۱۹۲۱/۳/۱ ئاراستەی کۆنگرە کرد بۆ ئەوەی سنوری کوردستان دیاری بکرێ (۱۱) و مەسەلەی کورد وەك دۆزێکی ڕەوا مامەڵەی لەگەڵ بکرێ.

بێجگە لە ئەرمەن، ئاشوریەکانیش بە پاڵپشتی زلهێزەکان و کۆنگرەی ئاشتییەوە بە پاساوی مافی مێژوویی ئاشوریەکان لە کوردستان دەیانویست دەوڵەتێکی ئاشوری لە کوردستان دابمەزرێنن لەو بارەیەوە . جۆزێف یعقوب لە کتێبی The Assyrian Quostion "مەسەلەی ئاشوریەکان" باس لە پێنج یاداشت دەکات کە ئاشوریەکان پێشکەش بە کۆنگرەی پاریسییان کردووە. زۆربەی ئەو یاداشتانەش لەلایەن کەسانی دینی بە پاڵپشتی جالیە و کۆمەڵەی ئاشوری لە دەرەوەی کوردستان ئاراستە کراون. هەندێ لە داواکانی ئاشوریەکان لەسەر بنەمای پاڵپشتی ئاشوریەکان بۆ هاوپەیمانەکان دامەزرابوون، بۆیە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ ئاشوریەکان یەکێ لە ئامانجە ستراتیژیەکانی ئاشوریەکان بوو. ئەو دەوڵەتەش سنورەکانی ئاوا نەخشەی بۆ کێشرا بوو: "ان الآشوريين يطالبون بدولة مستقلة تمتد حدودها من تكريت من الجنوب وحتى مقاطعة ديار بكر في الشمال ولخط موازٍ لضفاف الفرات في الغرب وحتى جبال ارمينيا في الشرق"(۱۲)

هەروەها لەو یاداشتەی یان (بەڵگە نامەی) بە ناوی نەتەوەی ئاشوری و

کلدانی پێش کەش بە کۆنگرەی ئاشتی کراوە، بێجگە لەوەی زۆر شوێنی دی لە ڕۆژهەڵات و باکوری کوردستان بە وڵاتی خۆیان دەزانن، ئەوا داوا دەکەن کە ئاشوری و کلدان حکومەتێکی نیشتمانی سەر بەخۆ دابمەزرێنن و بە خۆیان کاروباری خۆیان بە ناوی ئاشوری و کلدانی بەرێوە ببەن وە ئەوە دەوڵەتەش دەبێ هەموو و ویلایەتی موسڵ لە خۆی بگرێ[13]. ئەمەو تورکمانەکانی کوردستانیش بە پاڵپشتی تورکیا هەر بە ناوی مافی مێژوویی تورکمان لە کوردستان داوای مافە نەتەوەیی‌یەکانی خۆیان دەکرد[14]. هیچ کوردێ ناتوانێ نکوولی لەوە بکات کە ئەرمەن و ئاشوری و تورکمان لەگەڵ کورد لە کوردستان دەژین بە جۆرێ لە زۆر کات و شوێن جۆرە تەبایی‌یەکی وا لە نێوان کورد ئەرمەن و ئاشوری و تورکمان هەبووە وەك بڵێی لە ئەصڵدا ئەمانە یەك نەتەوەن. ئەمەو هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن کە هیچ دوور نی‌یە ئاشوری و تورکمان لە ئەصڵدا هەر کورد بن. هەر چۆنێ بێ، روسیا و بەریتانیا رۆڵی ئیستعماریانەی خۆیان بینی لە وروژاندن و خوڵقانی وەهمی دەسەڵاتی ئاشوری و ئەرمەنی بەسەر کوردستانەوە، چونکە پێش هاتن و دەست تێکەڵ کردنی روسیا و ئینگلیز لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی هیچ کێشەیەکی ئایینی لە نێوان کورد ئەرمەن / کورد ئاشوری نەبووە. ئەو روداوە جەرگبڕانەی لە کاتی جەنگیش رویاندا تەواو ئەوەیان سەلماند کە هەریەك لە ئیتحادیەکان هاوپەیمانەکان بۆ مەرامی گڵاوی خۆیان کورد و ئەرمەن و کورد و ئاشوری‌یان بە گژ یەك وەناوە. ئەوان لەبەرنامەیان دانەبووە هیچ کیانێ

نە بۆ کورد ‌وە نە بۆ ئاشوری و ئەرمەن دروست بکەن بەڵکو هەموو مەبەستی ئەوان ئەنجامدانی پرۆژەی سایکس بیکۆ سازانۆف بووە و مەسەلەی کۆنگرەی ئاشتی پاریسیش تەنیا تاکتیکێکی کاتی بووە هەر بۆ ئەوەیان بووە شەرعیەت بە داگیر کردنی خۆیان بدەن. ئەگەر وانەبوا خۆی هەریەك لە ئەرمەنی و ئاشوری "هاودین" ی هاوپەیمانەکان بوون بۆچی وەك لە کاتی شەڕ بەڵێنییان پێ دابوون کە دەوڵەتی سەربەخۆیان بۆ دابمەزرێنن، بۆچی حوکمیزاتییشیان بۆ لە تورکیا و عێراق داوا نەکرد؟!

## پەیمانی سیڤەر یەکەم پەیمان بوو بەرەسمی داوای دابەشکردنی کوردستانی دەکرد

لە ئاکامی شەڕی چالدێران ١٥١٤ و پەیمانی زەهاوی ١٦٣٩ کوردستان کرا بە دوو بەشی سەرەکی. ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن کوردستانی تورکیاو عێراق و سوریا کەوتە ژێر دەستی عوسمانییەکان هەرچی بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش بوو ئەوا هەر لە نێو قەڵەمڕەوی سەفەویەکان مایەوە. ئێران لە شەڕی یەکەمی جیهاندا بەشداری نەکرد و شەڕەکە زیاتر لە دژی دەوڵەتی عوسمانی بوو، بۆیە بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە پەیمانی نێو دەوڵەتییەکاندا ناوی نەهاتووە. ئەمەش بێجگە لەو هۆیەی سەرەوە، دامەزراندنی دەوڵەتی ئێران بە ئاراستەی ئینگلیز یەکێ لەو هۆیانەیتر بوو کەوا مامەڵە لەگەڵ ئەو بەشەی کوردستان بکرێ وەك بڵێی هەر لە ئەصڵدا بەشێکی ڕەسمی دەوڵەتی

ئێرانه‌! هه‌ر له‌و روانگه‌وه‌ نه‌ له‌ سایکس بیکـۆ وه‌ نه‌لـه‌ سـان ریمـۆ و سیڤه‌ر و لۆزان ناوی رۆژهه‌ڵاتی کوردستان نه‌هاتووه‌. به‌ شێوه‌یه‌کی‌تر ئه‌گه‌ر بێتو ئه‌و به‌شه‌ی کوردستان له‌ ده‌ست ده‌سه‌ڵاتێکی‌تر بوایه‌ له‌گه‌ڵ ستراتیژیه‌تی ئینگلیز دژ بوایه‌، ئه‌وا حه‌تمه‌ن ئه‌و به‌شه‌ی کوردستانیش ده‌بووه‌ جێگای گرنگی دانی هاوپه‌یمانه‌کان. له‌ هه‌رسێ به‌ندی ٦٢ و ٦٣ و ٦٤ی په‌یمانی سیڤه‌ردا ته‌واو ئه‌و راستی‌یه‌ به‌رجه‌سته‌ کراوه‌ که‌ رۆژهه‌ڵاتی کوردستان هیچ په‌یوه‌ندی له‌ دوورو نزیکه‌وه‌ به‌ کوردستانی عوسمانلی‌یه‌وه‌ نییه‌. به‌واتای پێش هه‌موو شتێ په‌یمانی سیڤه‌ر دانی به‌ شه‌رعیه‌تی دابه‌ش کردنی کوردستان ناوه‌. ئه‌وه‌ی له‌ به‌نده‌کانیشی هاتووه‌ سه‌ره‌تا ته‌نها ئاماژه‌ به‌ حوکمی زاتی بۆ کورده‌کانی باکور کراوه‌ نه‌ك هـه‌موو کوردسـتانی عوسـمانلی. ئه‌مـه‌ش هـه‌روه‌ك له‌گـه‌ڵ ره‌وتـی روداوه‌کـانی دوای جـه‌نگ ده‌رکـه‌وت تـاکتیکێك بـوو لـه‌ تاکتیکـه‌کانی ئینگلـیز لـه‌ مـه‌ڕ وروژانـدن و تۆقـاندنی که‌مالیـه‌کان سـه‌باره‌ت بـه‌ چاره‌نوسی ئاینده‌یان، به‌واتای راگه‌یاندنی په‌یمانی سیڤه‌ر هه‌ر زیاتر بۆ تۆقاندنی که‌مالی‌یه‌کان بووبۆ ئه‌وه‌ی به‌ مه‌رجه‌کانی ئینگلیز رازی بن. له‌ نه‌زه‌ری که‌مالی‌یه‌کان سیڤه‌ر سێداره‌ی تورکیا بوو. سۆڤیه‌تیش له‌ ئارمانه‌جه‌کانی په‌یمانی سیڤه‌ر ده‌ترسا، سۆڤیه‌تی‌یه‌کان باوه‌ڕیان وابوو که‌ جێبه‌جێ کردنی په‌یمانی سیڤه‌ر زیاتر سنوری باشوری وڵاته‌که‌یان ده‌که‌وێته‌ ژێـر خه‌تـه‌ری ئیمپریـالیزم. لـه‌ بـه‌ندی ٦٤ کـه‌ باسـی لـه‌ کورده‌کـانی باشـور ده‌کـات ئـه‌وا سـێ مـه‌رجی بنـه‌ڕه‌تی دانـراون بـۆ یه‌ککرتنی ئه‌و به‌شه‌ له‌گه‌ڵ باکور:

١- ئەگەر زۆربەی ئەو خەڵکانەی کەوتونەتە خۆرهەڵاتی فورات و باشوری خۆرئاوای ئەرمینیاوە داوای جیابوونەوە لە تورکیا بکەن.
٢- کۆمەڵەی گەلان لەو باوەڕە دابێت کە ئەم گەلە ئەتوانێ سەربەخۆیی و پێسپێری ئەمە بکات ئەوا تورکیاش لە ئێستاوە پەیمان دەدات ئەو پێسپێریە جێبەجێ بکات، دەست بەرداری هەموو ماف و ئیمتازاتێکی خۆی ئەبێ لەو ناوچەانەدا
٣- ماوەی ساڵێك بۆ پیادەکردنی ئەم بەندە دانرا.

لە کاتی راگەیاندنی پەیمانی سیڤەر زۆربەی باشور لە ژێر حوکمی راستەوخۆی مێجر سۆن حاکمی ئینگلیز لە کوردستانی خواروو دابوو[١٥] لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٠ ئینگلیز بڕیای ئەوەی‌دا کە مەسەلەی دەوڵەتی کوردی شتێکی عەمەلی نی‌یە و لەجێ‌ی خۆی نی‌یە، پاشان سەبارەت بە مەرجی یەکەم، ئینگلیز حکومەتەکەی شێخ مەحمودی بەزەبری هێز لە نێو برد بوو، مێجر سۆن لە رێگای "پێش کەوتن"ەوە خەریك بوو کەلێنی نێوان شێخ و رۆشنبیرانی کوردی گەرەوتر دەکرد. ئەمەش لە خۆڕا نەبوو، چونکە ئینگلیز بە چاوی شێخ و سەرۆك عەشیرەتێك سەیری شێخی دەکرد نەك وەك سەرکردەیەك[١٦]. ئۆزدەمیرو سەرۆکەکانی‌تر دەورێکی گرنگیان بینی بۆ ئەوەی سەرانی کورد و رۆشنبیرانی کورد لەناو خۆیاندا تەبا نەبن. لە بەشی باکوری وڵاتیش سەرکردەکانی ئەوێ و ئەوانەی لە ئەستەنبوڵ بوون هەر یەکەی چارەنووسی خۆی بەرەوە ئاقارێکی نادیار دەبرد. ئالەو کاتەش کەمالی‌یەکان هەموو هەوڵێکی جدی خۆیان بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی

سەرکردە خێڵەکی یەکان لە رۆناکبیرانی کورد دوور بکەنەوە و واز لە سیڤەر بێنن. بەواتای ئینگلیز دەیانزانی کە هەموو کورد لەگەڵ جیابوونەوە لە تورکیا نی یە، بۆیە ئەو مەرجەی لە پەیمانەکەدا دانابوو. ئەوا گریمان هەموو سەرکردەکان خیلافاتی خۆیان بەلانابایەو ببانە یەك دەنگ، ئەوا دەوڵەتی کوردی  بە گێرەی سیڤەر هەر دانەدەمزرا چونکە دەبا کۆمەڵەی گەلان بکاتە ئەو قەناعەتەی کە کورد دەشێن دەوڵەتی خۆیان بەرێوە ببەن. لە ئەزەری ئینگلیز کورد کۆمەڵێ عەشائیرن لە چاو گەلانی دی ناوچەکە دواکەوتوون ئەو نوختەیە هەتا ئاشووری و ئەرمەنی یەکانیش دەیانوروژاند بە بیانوی ئەوەی ئەوان لە کورد حەزاری ومەدنی ترن بۆیە ئەوان شایەن ترن لە کورد کە دەوڵەتیان هەبێت، هەرچی پیاوانی  دەوڵەتی "خەلیفە" بوون لە ئەستەنبۆڵ ئەوا تەواو لە ژێر ئاراستەی ئینگلیز دابوون. دەوڵەتی خەلیفە بە رەسمی رەزامەندی خۆی لەسەر سیڤەر دابوو. لە ئەصڵدا خوودی کێشەکە دەبزو لە نێوان تورکیا – کورد بوایە، بەلام ئینگلیز نەك هەر ئەومندەی بە دەوڵەتی خەلیفە رەوا نەدەبینی، بەڵکو لە ئاقار هەوڵەکانی کەمالی یەکان بۆ روخانی دەوڵەتی خەلیفە بێ دەنگ بوون. کەمالی یەکانیش وەك وتمان سیڤەریان بە سێدارەی خۆیان دەزانی. مەسەلەی دانای سالێك بۆ پیادەکردنی پرۆژەکە خۆی لەخۆیدا تاکتیکی دی ئینگلیز بوو دەرهەق بە کورد ئەگەر نا پێشتر شێخ مەحمود بەتەنها نامەیەك توانی سەرانی ئینگلیز بەتایبەتی نوئیل و ویلسن رازی بکات کە خۆی حکومەتێکی کوردی دابمەزرێنی. ئەو

کاتیش نه دەوڵەتی عێراق دروست ببو وە نە دەوڵەتی تورکیا. بە واتای ئەگەر ئینگلیز رژد بایە لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بۆ کورد ئەوا وەك چۆن لە ساڵی ١٩١٨ بە حوکمداریەتی شێخ محمود رازی بوو ناوا دەستبەجێش رازی دەبوو کورد دەوڵەتی خۆی هەبێ.
وێرای ئەو هەموو راستیانە، ئەوا ئینگلیز هەر لە رۆژی راگەیاندنی پەیمانی سیڤەردا بڕیاری داگیر کردنی باکوری کوردستانی دا چونکە ئەو ناوچەیە، کە وەك لە سایکس بیکۆ بڕیاری لەسەر داربوو دەبوو بۆ روسیا بێت بەلاّم کودەتای ئۆکتۆبەر وای کرد روسیا سوپای خۆی لە ناوچەکە بکێشێتەوە، بە واتای مەسەلەی جاردانی حوکمیزاتی بۆ باکور زۆر ئاسان بوو چونکە ناوچەکە هیچ هێزێکی دژە ئینگلیزی لێ نەبوو. لە بریتی ئەوە نوسەری کتێبی "الرجل الصنم" کە ئەفسەرێکی تورکی سەردەمی کەمالیەکان بووە، دەنوسێ ئینگلیز گلۆپی سەوزی بۆ مستەفا کەمال هەڵکرد بۆ ئەوەی بچێ دەست بەسەر ئەو ناوچەیە بگرێ و راپەڕینی میللی بەرپا نەبێ[1]
لەو چەند لاپەرەیەدا دەفامرێتەوە کە پەیمانی سیڤەر کارێکی ئینگلیزی بووە لە دژی تورکیا و هەندێ لە هاوپەیمانی خۆی بە کاری هێناوە. ئەگەرنا کۆنگرەی پاریس، کە کارەکانی ساڵێك و سێ رۆژی خایەند لە ١٩١٩/١/١٨ - ١٩٢٠/١/٢١، لە بریتی چارەسەرێکی عادیلانەی کێشەی کورد و ئەرمەن و ئاشوری ، ئەوا ئەوەی هەش بوو ئینگلیز بەزەبری هێز لە نێوی بدر بە تایبەتی حکومەتەکەی شێخ مەحمود کە لە حوزەیرانی ١٩١٩ لە نێو برا. بیانوی لە ناوبردنەکەش بە هیچ جۆرێ لەگەڵ

بانگاشه ئیجابی‌یەکانی ئینگلیز یەکی نەدەگرتەوە "ئینگلیز دەیانگوت شێخ پێی لە بەری خۆی زیاتر راکێشاوە"[١٧] ئەو هەموو پێ لە بەر راکێشانەی شێخ فراوانکردنی سنوری دەسەلاتی حکومەتەکەی بوو - بەواتا دەیویست حکومەتەکەی هەر لە سلێمانی نەبێ بەڵکو هەموو باشوری کوردستان بگرێتەوە لە نەزری ئینگلیز ئەمە تاوان بوو، چونکە ئەوان شێخ و کوردیان وەك سەرۆك عەشیرەتێك دەبینی نەك وەك سەرۆك دەولەتێك و میلەتێك. سەیر دەکەی کە کۆنگرەی ئاشتی خەریکی کارە "ئاشتیخوازەکانی" خۆی بووە، ئینگلیز ئا لەو کاتە بە زەبری هێز حوکمداری‌یەتی خوارووی کوردستانی لە نێو بردووە. بەلام کە ئینگلیز تەواو بۆی دەرکەوت کە کەمالی‌یەکان تەواو لە راژەی سیاسەتی ئینگلیز دان ئەوا نەك هەر ماهیەتی پەیمانی سیڤەریان ئاشکرا کرد، بەڵکو پشتیان لە ئەرمەن و ئاشوری و هەتا یۆنانی‌یەکانی ئەزمیریش کرد. ئەمەو ئەگەر بزانین یۆنان بە ئاراستەی ئینگلیز و فەرەنسا ئەزمیری داگیر کردبوو. بەم جۆرە وەك لە بەرایی ئامارەمان پێ دا سیڤەر لە رووی کردارەوە ئیقراری دوو کوردستانی کرد بوو: کوردستانی عوسمانلی و کوردستانی ئێرانی. هەروەها باکور کە بە پێی سایکس بیکۆ سازانۆف بریار درابوو بدرێ بە روسیا، ئەوا ئەو بەشە هەر بەپێی خودی پەیمانەکە لە بەشی باشور جیا کرابۆوە. بە واتای بە حوکمی ئەوەی ئینگلیز لە رووی عەسکەریەوە فەرماندەیی باکوری نەدەکرد هەروەها بە حوکمی ئەوەی ئەو دەڤەرە ترسی لەسەر بەرژەوەندی‌یەکانی سۆڤیەت هەبوو، بۆیە لە سیڤەردا ئامارە بە

حوکمیزاتی بۆ ئەو بەشەی کوردستان کراوە هەرچی مەسەلەی باشوری ولاتیشە ئەوا لەبەر ئەوەی لە رووی عەسکەرییەوە تا رادەیەك لە ژێر حوکمی راستەوخۆی ئینگلیز دابوو هەروەها ناوچەکە نەوتێکی زۆری هەبوو ئەوا ئینگلیز "لکاندنەوەی" ئەو بەشەی بە باکور بە هەندێ مەرجی تەعجیزی بەست بۆوە.

## پەیمانی لۆزانی ۱۹۲۳

بە پاڵپشتی عەسکەری و لۆجستی هەندێ لە هاوپەیمانەکان وەك فەرەنسا و ئیتالیا هەروەها سۆڤیەت ، کەمالییەکان بوونی خۆیان لە تورکیا کردە ئەمری واقع. ئەو رەوشەی ئەوسا هەمووی لە بەرژەوەندی کەمالییەکان و لە دژی کوردەکان بوو. لەو نێوە بەتایبەتی پاش سەرکەوتنی کەمالییەکان بەسەر یۆنانییەکان لە ئەزمیر و دەوڵەتی خەلافەتی ئەستەمبوڵ، ئینگلیز بیری لە کۆنگرەیەکی دی ئاشتی دەکردەوە. ماهیەت و ستراتیژیەتی کۆنگرەکە خۆی لەخۆیدا هەڵوەشاندنەوە یان هەر هیچ نەبێ هەموار کردنی بەندەکانی سیڤەر سەبارەت بە کوردەوە دەگەیاند. لە ئاکام هەر یەکە لە ئینگلیز و تورکیا بە چەند ئامانجێك بەرەو کۆنگرەی ئاشتی لۆزان بەرێ کەوتن. کۆنگرەکە لە دوو ماوەی جیاوازدا دەستی بە کارەکانی خۆی کرد. جاری یەکەم کۆنگرەکە لە (۲۰)ی تشرینی دووەمی ۱۹۲۲ دەستی پێ کرد هەتا (٤)ی شوباتی ۱۹۲۳ خایەند. جاری دووەمیش لە (۲٤)ی نیسان دەستی پێ کرد هەتا ۲٤ تەمووزی ۱۹۲۳ی خایەند [۱۸] کێشەی

ویلایـەتی موسـڵ تـەوەری سـەرەکی دان وسـتاندنی هـەردوو شـاندی ئینگلیـز و تورکـی بـوو. لـە مـاوەی یەکـەمدا لـۆرد کـیرزۆنی سـەرۆکی شاندی ئینگلیز توانی قەناعەت بە ئینینوی سەرۆکی شاندی تورکی بێنێ کە مەسەلەی ویلایەتی موسڵ بە جیا بە دوو قۆڵی لە نێو خۆیـان بـاس بکـەن[19]. لـە ئاکـام هـەر دوو لا لـە کۆتـایی مـاوەی یەکـەمدا ١٩٢٣/٢/٤ ڕێکەوتن کە کێشەی باشوری کوردستان و ولایەتی موسڵ لە کارنامەی کۆنگرە دەربێنن و مۆڵەتی نۆ مانگ بە تورکیاو بەریتانیا درا بـۆ ئـەوەی لـەو ماوەیـەدا بگەنـە تێگەیشـتنێکی راسـتەوخۆ ئەگـەر نەگەیشتنە یەك ئەوا کێشەکە ڕەوانەی کۆمەڵەی گەلان بکرێ[20]. ئەو مەسـەلەیە، پەیوەست بوو بە کورد بەلاّم هیچ لا ڕێیان بە کورد نـەدا بەشداری ئەو کۆنگرەیە بکەن و لە چارەنوسـی خۆیـان بکۆڵنـەوە. لـە کۆتایی ماوەی دووەمیش بە واتای ١٩٢٣/٧/٢٤ کۆنگرەکە کۆتایی پـێ هات بێ ئەوەی چارەسەری مەسەلەی باشوری کوردستان بکرێ. هێندە نەبێ، تورکیا وەك دەوڵەتێك لەگەڵ بەشی باکوری کوردستاندا دانی پێ دانرا و باشوری کوردستانیش ڕەوانەی کۆمەڵەی گەلان کرا. لە نەزەری تورکیا لۆزان ویلایەتی موسڵی لە تورکیا دابڕی، بەلاّم گەرەنتی هێمنی و تەناهی بۆ تورکیا مسۆگەر کر[21]

لە دەقی پەیمانی لۆزان دا ناوی کورد نەهاتووە. مەسـەلەی دەوڵـەتی کوردی بۆ تاکی غـەیرە تـورك و غـەیرە موسـڵمان بـە هیـچ جـۆرێ لـە پەیمانەکەدا ئاماژەی پـێ نـەکراوە. بـەلاّم بە حوکمـی ئـەوەی بەشـێکی کوردسـتان لـە تورکیایـە هـەروەها کەمایەتی‌یـەکی دینـی وەك ئەرمـەن و

ئاشوری لە تورکیادا هەیە، بۆیە بە شێوەیەکی ناراستەخۆ ئاماژە بە مافی رۆشنبیری و دینی کراوە. ئەو ماف و ئەرکانە لە پێنج بەندی لۆزان بە ژمارە ۳۷ ، ۳۸ ، ۳۹ ، ٤٠ ، ٤٤ ئامارژەیان پێ کراوە: بە پێی خاڵی ۳۸ ئەوا تورکیا بەڵێن دەدات کە ئازادی تەواو بە هەموو دانیشتوانی تورکیا بدات بێ دروست کردنی جیاوازی سەبارەت بە رێد و نەتەوەو زمان و رەگەز و دین و عەقیدە. هەروەها کەمایەتی‌یە غەیرە موسڵمانەکانیش مافی هات وچۆ و کۆچ کردنیان هەیە[٢٢]. بەگوێرەی ئەو بەندە لە فەراهەم هێنانی ئازادی‌دا هیچ جیاوازیەك لە نێوان گەلانی ناو تورکیا نی‌یە بەواتای کورد و تورك هەردووك دەبوو وەك یەك ئازاد بن. ئاشوری و ئەرمەنەکانیش هەر وە بەر هەمان پەیرەو دەکەون. محمد شێرزاد لە "نضال الاكراد" لاپەرە (٣٦) د. عەزیز شەمزینی لە لاپەرە (١١٥ - ١١٦)ی کتێبی "جولانەوەی رزگاری‌ی نیشتمانی‌ی کوردستان / دەڵێن لە خاڵەکانی ٣٨، ٣٩ ، ٤٠ی بەشی سێ‌یەمی پەیمانی لۆزان دا وا هاتووە:

دەوڵەتی تورکیا دەستەبەری ئەوە دەبێ کە کورد، کەمە رەگەزێکی تورکیا پێکدەهێنێ، بۆی هەیە بە ئاشکرا بە زمانی نەتەوەیی خۆی بدوێ، لە دادگاکانی تورکیادا بەکاری بێنێ، رۆژنامەو گۆفار و پەرتوکی پێ دەرکا، بۆی هەیە یانەی زانستی ، کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی کورد زمان پێکەوەبنێ و بەو پەڕی ئازادی‌یەوە لە ناوخۆی دەرەوەی تورکیا هاتوچۆ بکا و هەموو ئەو مافە سیاسی‌یانەی دەبێ کە تورکەکان هەیانە" د. حامد لە کتێبی "المشكلة الكردية في الشرق الاوسط" لاپەرە

(٦٣) دەڵێ: لە خاڵی ٣٩ ئازادی بە نیشتمانە پەروەرانی کورد و ئەرمەن دراوە کەبە زمانی خۆیان لە بەردەم دادگاکان بدوێن" بە واتای چۆن بەناو لە پەیمانی سیڤەردا ناوی کورد و ئەرمەن هاتووە، ئەوا لە پەیمانی لۆزان بە ئاماژەکردن هێما بۆ کورد و ئەرمەن کراوە. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە کە لە کۆنگرەی ئاشتی لۆزان، کە ئینگلیز خۆی تێدا باڵا دەست بوو دەست بەرداری مافەکانی کورد و ئەرمەن و ئاشوری بووە. ئەو ناو هێنانە تەماوی‌یەی کورد و ئەرمەن و ئاشوری لە لۆزان دا بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ مافی بە تورکیا دەدا کە لەمەو دوا رەوشی سیاسی وڵات بە ئاقاری بەرژەوەندی‌یەکانی تورکیا بەرێ و نکووڵی لە بوونی کورد و ئەرمەن و ئاشوری بکات، بەتایبەتی کورد. لە پاش کۆنگرەش هەروا کەوتەوە. لە بەندی (٣٧) تورکیا بەڵێن دەدات کە هەرگیز یاسایەك دەرنەکا یا بریارێك دەربخا ئەو مافانەی لە هەرسێ بەندەکەی پێشوو خرانە بەرچاو پێشێل بکات[٢٣]. خاڵی ٤٤یش باسی ئەوە دەکا کە بەڵێنەکانی تورکیا بەڵێنی جیهانین، لەبەر ئەوە بە هیچ شێوەیەك بۆی نیە ئەو بەڵێنانە بشکێنێ ئەگینا ئەو دەوڵەتانەی پەیمانی لۆزانیان مۆر کردوە دەوڵەتە ئەندامەکانی کۆمەڵەی گەلان بۆیان هەیە سەرپەرشتی‌ی جێبەجێ کردنی بەڵێنەکان بکەن و تورکیا ناچار بکەن ئەو بەڵێنانە جێبەجێ بکا کە بە دەوڵەتانی داوە[٢٤] ئەگەر پێ لە هەرسێ بەندی ٣٨ ، ٣٩ ، ٤٠ ئاماژە بە دەوڵەت و کیانی کوردی نەکراوە بە واتای بەتەواوی بیرۆکەی دەوڵەتی کوردی هەڵوەشێندرایەوە.بەڵام لەو بەندانە دان بەوەنراوە کە رەگەزێکی غەیرە

تورکی له دەوڵەتی تورکیا هەیە. لەمەش زیاتر ئەو رەگەزە غەیرە تورکی‌یە زۆر مافی رۆشنبیری و کەلتوری بۆ دابین کراوە. دەمارگیری نەتەوەیی دەسەلاتی تورك ئەوەندەش بۆ کورد بە زۆر زانی. دەوڵەت لە نەزەری کەمالی‌یەکاندا بوو بە بونێکی پیرۆز بە جۆرێ دەوڵەتی تورکیا پەرلەمانی ناچار کرد خودی پەیمانی لۆزان هەڵوەشێنێتەوە. هەروەها بەپێی دەستوری سزای تورك ژمارە (٨٨) هەموو شتێك دژ بە تورکیا قەدەغەکرا[٢٥] لە پاشان مکومتر بوونی دەسەلاتی عەلمانی تورکی ئەوا بە گوێرەی بەندی ١٤٠ ، ١٤١ ، ١٤٢ ، ١٤٣ زمانی کوردی لە تورکیا یاساغ کرا[٢٦] ئەو کردەوانەی تورکیا پێ‌شێلی بەندی ٣٧ و ٤٤ی پەیمانی لۆزانی دەکرد، کەچی هاوپەیمانەکان لەبەرامبەر ئەو کردەوانەدا هیچ هەڵوێستێکیان نەنواند. ئەو بێ دەنگی‌یەی هاوپەیمانەکان بەتایبەتی ئینگلیز لە بەرامبەر کردەوە نامرۆیی‌یەکانی دەوڵەتی تورکیا لە هەمبەر کوردا دەگەڕێتەوە بۆ چەند دەست بەرداری‌یەکی تورکیا بۆ ئینگلیز. پێش هەموو شتێ هەتا سەردەمی کۆنگرەی ئاشتی لۆزان ئەستەمبوڵ پایتەختی رۆحی تورکیا هەر لە ژێر کۆنترۆڵی هاوپەیمانەکان بوو، بەڵام هەرکە شاندی حکومەتی ئەنقەرە لە لۆزان بە پێشنیارەکانی ئینگلیز رازی بوو، سوپای هاوپەیمانەکان بەبێ تەقە شاری ئەستەمبوڵیان چۆڵ کرد[٢٧] پێشنیارەکانی ئینگلیز لە لۆزان دا هیچ پەیوەندی بە مافەکانی کوردەوە نەبوو بە واتای ئینگلیز لە لۆزان تەواو دەست بەرداری باکوری کوردستان ببوو بۆ تورکیا بە مەرجێ تورکیا ئەو مەرجانە جێ‌بەجێ‌بکات[٢٨]:

١- توركيا پەیوەندی بە ئیسلامەوە نەمێنێ.

٢- خەلافەتی ئیسلامی هەڵوەشێنێتەوە.

٣- توركیا بەڵێن بدا بە دامرکاندنەوەی هەر بزوتنەوەیەك كە لایەنگرانی خەلیفە پێی هەڵبستن.

٤- توركیا بۆ خۆی دەستورێكی مەدەنی هەڵبژێرێ لە جیاتی دەستوری عوسمانی كە لەسەر بنەماكانی شەریعەتی ئیسلام دامەزراوە.

لە (٣٠)ی تشرینی یەكەمی ١٩٢٣ ئەنجومەنی نیشتمانی بالآی تورك سیستەمی بە كۆماری كردن و عەلمانی كردنی توركیای راگەیاند هەروەها لە سێی مارتی ١٩٢٤ بەپێی هەرسێ بەندی ژمارە ٤٢٩ ، ٤٣٠ ، ٤٣١ی دەستوری توركی سیستەمی خەلافەتی ئیسلامی لە توركیا هەڵوەشێندرایەوە.

لەپاشان لە رێگای كۆمەڵەی گەلانەوە، چارەنوسی باشوری كوردستان لە ژێر دەستی توركەكان هێنرا دەرەوە ئەو بەشەی كوردستان كە بڕیار بوو لە لۆزان چارەسەر بكرێ لە بەشی باكور جیا كرایەوە بەزەبری هێز كرایە بەشێك لە عێراقی عەرەبی.

بەمجۆرە لە كۆنگرەی ئاشتی لۆزان هیچ رێزێك بۆ كورد دانەنرا. ئەمەو كورد بە زۆر رێگا هەوڵیدا لەگەڵ تورك و ئینگلیز رێك بكەوێ. بەلآم بەرژەوەندییەكانی ئینگلیز و تورك زۆر گەورەتر بوون لە مافەكانی كورد. پەیمانی لۆزان ئەگەر بەندەكانی ٣٨ ، ٣٩ ، ٤٠ ی جێبەجێ بكرابان - كە سەبارەت بەمافەكانی كورد هیچ پایەكی ئەوتۆیان نەبوو

– ئەوا دەکرا کە چارەنووسی کورد بەو ئەرده نەبڕێ کە برا. بەڵام لە مێژوودا دەرفەتی رامان نی‌یە ئەوەی رووی‌دا ئەبوو رووبدا چونکە هیچ کاتێ بەرژەوەندی ئیستعمار جا چ ئیستعماری بیانی بێ یان ئیستعماری تورکی، عەرەبی ، فارسی دەگەڵ ویستی گەلانی ئازادیخواز یەك ناگرێتەوە. هەر لەسەر ئەو بنەمایە ئیستعماری ئینگلیز و ئیستعماری تورك هاوشان لەگەڵ ئیستعماری عەرەب بەزەبری هێز نیشتمانی کوردیان پارچە پارچە کرد و هەرچیان لە دەست هات لە دژی کورد درێغیان نەکرد.

## پەراوێزەکان:

١-بیت سمؤئیل، الآشوریون في مؤتمر الصلح باریس ١٩١٩، ص

٢-م. رەسوڵ هاوار، کورد و باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دوهەمی جیهان -بەرگی یەکەم- سلێمانی ٢٠٠٠ ، ل ٥٣١-٥٣٢.

٣-سەلام ناوخۆش ، کوردستان چۆن داگیر کرا و دابەش کرا، کوردستان ٢٠٠٠، ل٧٤.

٤-د. جرجیس حسن، ترکیا في الاستراتیجیة الأمریکیة بعد سقوط الشاه، ١٩٩٠، ص٨٢-٨٣.

٥-سەرچاوەی سەرەوە.

٦-سەرچاوی ژمارە (٢).

٧-سەرچاوەی ژمارە (٣) و (٤).

٨-کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی، بغدا ، ل٥١.

٩-سەنتەری برایەتی ژمارە (١٦) ، ل٧٧.

١٠- د. کمال مظهر، کردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی ، بغداد ١٩٨٤ ، ص٢٦٧. هەروەها بڕوانە سەنتەری برایەتی ژمارە (٩)

١١- سەرچاوەی ژمارە (١) ، ل١٤.

١٢- سەرچاوەی سەرەوە ، ل٢٨.

١٣- سەرچاوەی سەروە ، ل٣٠.

١٤- محمد سلام، مافی مێژوویی غەیرە کورد بەسەر کوردستانەوە، ڕۆژنامەی پەیام. هەروەها کتێبی مافی مێژووی غەیرە کورد بەسەر

کوردستانەوە - کۆمەڵە نووسینێك لە بارەی ناسیۆنالیزم، هەولێر ١٩٩٩، ل٣٥.

١٥- ئاڵای ئیسلام ژمارە (٢-٣) ئەیلولی ١٩٩٩ ، ل٢

١٦- دیرك كینان كورد و كوردستان ، وەرگێڕانی سەلام ٢٠٠٠.

١٧- سەرچاوی پێشوو.

١٨- د. حامد محمود، المشكلة الكردية في الشرق الأوسط ، مصر، ص٦٢.

١٩- د. كمال نۆقە، کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ وەرگێرانی سەلام، کوردستان ٢٠٠٠

٢٠- سەرچاوەی ژمارە (١٨) و (١٩).

٢١- سەرچاوەی ژمارە (١٩).

٢٢- محمد شێرزاد، نضال الأكراد هەروەها سەرچاوەی ژمارە (١٨).

٢٣- د. جەمال نەبەز، کوردستان و مەسەلەی کورد هەروەها بڕوانە د. عزیز شەمزینی، جولانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان ، سلێمانی ١٩٩٨، ل١١٦

٢٤- د. عزیز شەمزینی، ل١١٦

٢٥- سەلام، دوزی کورد لە نێوان داچوون و هەڵچوونێکی ناکۆك دا هەولێر ١٩٩٢، ل٢٤

٢٦- گۆڤاری بانگی هەق، ژ(١) ١٩٩١، ل٢٤.

٢٧- سەلام، کوردستان چۆن داگیرکرا و دابەش کرا، کوردستان ١٩٩٨، ل٥٢.

## پێشەکی:

لە پاش ئاگربەسی مۆدرۆس، پەیتا پەیتا ململانێ یەکی دی لەنێوان بەردی هاوپەیمانەکان بەتایبەتی بەریتانیا و فەرەنسا سەری هەڵدا. بەریتانی یەکان هەر بە ویلایەتی بەسرا و بەغدا رازی نەبوون، بەڵکو دەیانەویست ویلایەتی موسڵیش بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان. ئەو ویلایەتەش زۆربەی بەگوێرەی پەیمانی نهێنی سایکس-بیکۆ بۆ فەرەنسا دانرابوو، بەڵام هۆکاری نەوت و جیۆپۆلیتیکی شوێنەکە و هەروەها پێکهاتەی نەتەوەیی و دینی و مەزهەبی هەرسێ ویلایەتەکە، وایان لە بەریتانی یەکان کرد کە بە هەر جۆرێ بێ ویلایەتی موسڵ بخەنە نێو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیان لەهەردوو ویلایەتەکەی تردا. گرتنی شاری موسڵ لە پاش ئاگر بەسی مۆدرۆس و پەیوەندی کردنی ئینگلیز بە شێخ محمود ئەو پرۆسەیەی بۆ ئینگلیز ئاسانترکرد. ململانێ ی بەریتانیا و فەرەنسا لەسەر ویلایەتی موسڵ لە کۆنگرەی سان ریمۆ بەرەو چارەسەرکردن چوو، ئەویش پاش ئەوەی کلیمانسۆی سەرۆک وەزیرانی فەرەنسا بە پێشنیاری لوێیدی سەرەک وەزیرانی بەریتانیا رازی بوو، ئینگلیز بۆ ئەوەی لەسەرەتا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ حوکمی کوردستان بکات مێجەر نوئیلی بۆ سلیمانی هەنارد. لەو لاوەش کەمالی یەکان، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی ئینگلیز لەناو عەشیرەتەکانی کورد بێ هێز بکەن ئۆزدەمیریان بۆ باشوری کوردستان هەنارد. هەر یەک لەم دووە هەر یەکێ بەجۆری دەیەویست کوردەکان بۆ لای خۆیان کێش بکەن.

ئەم نووسینە هەوڵ دەدات لە ماهیەتی هەوڵی هەر یەک لە مێجەر نوئیل و ئۆزدەمیر بکۆڵێتەوە. ئەوە بخاتە ڕوو ئاخۆ ئەو «دوو»ە مەبەستیان بووە هیچ شتێ بۆ کورد بکەن. بۆیەش ئەم بابەتەمان هەڵبژارد، چونکە ئەوانەی مێژووی نوێ ی کوردیان نووسیوەتەوە باس لە هەردووک وەک یەک ناکەن، هەندێ مێجەر نوئیل بە لۆرانسی کوردان دەناسێنن. هەندێکیش لەژێر کاریگەری دبلۆماسیەتی ئۆزدەمیردا تووشی تەفرەبوون و باوەڕیان وابووە کە ئۆزدەمیر گەرەکی بووە شتێ بۆ کورد بکات.

## بەشی یەکەم: مێجەر نوئیل و مەسەلەی کورد.

### ١-١- ئینگلیز و فەرمانڕەوای ناراستەوخۆی کوردستان.

هەر کە، ئینگلیز دەستی بەسەر هەردوو ویلایەتی عەرەب نشینی بەغدا و بەسرا دا گرت، نەوتی کوردستانی باشور دەسەڵاتدارانی ئینگلیزی پەلکێش کرد بۆ ئەوەی ئەو بەشەی کوردستان کە ناسرابوو بە ویلایەتی موسڵ بگرن. لەو بەشەی کوردستان دا شێخ محمود سەرکردەیەکی هەرەناسراوی کورد بوو. ئینگلیز لەکاتی شەڕ و کۆتایی شەڕیش وەک دێرک کینانی و ئەدمۆندز لە کتێبەکانیان دەنوسن پەیوەندیان بەسەرکردەکانی کوردەوە کردبوو[١]، شێخ محمود یەکێ لەو سەرکردانەبوو کە بەنامە پەیوەندی بە ئینگلیز کردبوو بۆ ئەوەی لە بەرامبەر دەرکردنی سوپای عوسمانی لە سلێمانی بیکەن بە حکمداری کوردستان[٢].

لە بەرایی فەرمانڕەوایی کردنی کوردستان بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ یەکێ لە تاکتیکەکانی ئینگلیز بوو، ئەمەش پەیوەست بوو بە پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردی. بۆ مەیسەرکردنی ئەو پیلانە ئینگلیز چەندەها ئەفسەری هەواڵگری نارده کوردستان. ئەحمەد خواجە لە کتێبی «چیم دی» بەرگی دووەم لاپەڕە (٧) ناوی ئەفسەرەکان بەم جۆرە تۆماردەکات[٣]:

١- میجەر نوئیل: فریشتەی بێ فەڕو تەڵەدانەری گیانی کورد.
٢- میجەر گرنیهاوس: حاکمی سیاسی.
٣- میجەر دانلیس: فەرماندەی لیڤی.
٤- میجەر سۆن: حاکمی سیاسی.
٥- کپتان هولت: معاون حاکم سیاسی- و سەرپەرکەری گوزارش.
٦- کپتان کووک: لە رانیە، بەرپاکەری ئاشووب و بەدەستی خۆی فەتاح بەگی کوشت.
٧- کپتان لیس: دوژمنی کورد و نۆکەری هەلەبجە.
٨- کپتان بۆند: حاکمی چەمچمال و گێرەشێوێن.

٩- کپتان چیمەن: تەلەتەقێنی راوی خوێنی کورد.
١- کپتان لاین: هەڵسوڕێنی سیاسەتی ئاڵوزانی مافی کورد و ماکی جنێو و بێ ئابڕوویی.
١١- میجەر ادموندس: حاکمی رانیە و قەلادزە و پسپۆری رۆژهەلات و هونەرمەندی دروست کردنی دەزگای جاسوسی.

ئەمە و چەندان ئەفسەری تر لە دەڤەری بەهدینان دامەزرابوون بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ کاروباری و لات بەرێوەببەن یەکەم ئەفسەر کە ئەو ئەرکەی پێ سپێردرابوو میجەر نوئیل بوو. نوئیل ئەفسەرێکی چالاکی بەریتانی بوو ماوەیەک لە نێوان کوردەکانی ئێران بوو و ئاگای لە رەوشی سیاسی و کۆمەلایەتی کۆمەڵی کوردەواری هەبوو. ئەو خاسڵەتانە وای لە ولسنی کۆمیساری بالای ئینگلیز لە عێراق کرد کە میجەر نوئیل بەرەو کوردستان بنێرێ. میجەر نوئیل لەگەڵ دکتورێک و ئەندازیارێک و چەند ئینگلیزێکی تر هاتە سلێمانی. لە کتێبی یاداشت-رەفیق حلمی و چیم دی-ئەحمەد خواجە و کوردستان فی عصر السلام بعد الحرب العالمیە الاولی-ی احمد عثمان هاتووە کە شێخ مەحموود زۆربەی خێڵەکانی سلێمانی و دەوروبەری کۆکردۆتەوە و میجەر نوئیل لەپێش ئەوانەدا بەزمانی فارسی وتاری داوە و وتویەتی: «بەناوی حکومەتی بریتانی و حاکمی گشتی عێراق قسەتان لەگەڵ دەکەم. ئەمرۆ ئێوە لە دیلی رزگارتان بوو ئیتر ئێوە سەربەست و ئازادان. شێخ مەحموود حکمداری کوردستانە. لەسەر فەرمایشی حاکمی گشتی لە بەغدا ئەم مژدەیەتان دەدەمێ»[٤] ولسنی حاکمی گشتی عێراقیش هەر بۆ زیاتر هێورکردنەوەی رەوشەکە و رەواندنەوەی گومانی کورد لەبەرامبەر ئینگلیزدا بەزمانی فارسی نامەیەکی ئاراستەی شێخ مەحموود کرد. لەنامەکەدا هاتووە: «لە حکومەتی صاحب الجلالەوە فەرمانم پێ درا پێتان بگەیەنم. لەم رۆژانەدا لێ دوانی سەربەستی- استقلال- کوردستان تەواو نەبێت. کورد سەربەخۆ ئێوەیش بە حوکمدار ناسراون»[٥] هەروەها

لەسەرچاوەیەک ئاماژە بەوە کراوە کە خودی مەلیکی بەریتانیا جۆرجی پێنجەم پیرۆزبایی لە شێخ مەحموود کردووە وەک لە نامەکەدا هاتووە «ئێمە تەبریکی سەعادەت و ئیستقلالیەتی کورد دەکەین. ئومێد دەکەین دۆستایەتیمان هەر لەزێدەیی بێت. ئیمزا مەلیکی بەریتانیای گەورە جۆرجی پێنجەم»[٦] ئەدمۆندس لە کتێبەکەی خۆی کورد، تورک، عەرەب باس لە سیاسەتی ئەوسای ئینگلیز لە کوردستان دەکا و دەنوسێ گرنگی دان بە شێخ مەحموود هەربۆ دوورکردنەوەی دەسەلاتی تورک بوو لە ناوچەکەدا... ئەگەر تا حوکمداری یەکەی شێخ مەحموود لە نەزەری ئینگلیز واتای بە خشینی سەربەخۆیی بۆ کورد نەدەگەیاند. ئینگلیز، شێخ مەحموودی وەک نوێنەری خۆی لە کوردستان تەماشا دەکرد[٧] هەروەها لەمەش زیاتر شێخ مەحموود لە دیدی ئینگلیزەوە تەنیا شێخێکی خاوەن عەشیرەت بوو نەک حاکمێکی سیاسی و عەسکەری «دەولەتی کورد»ی لە پاشان وە نەبێ شێخ مەحمودیش لەمە نەگەیشتبێ کە ئەو لە نەزەر ئینگلیز پایەی چەندە.
هەروەها گرنگە ئاماژە بە پێکهاتەکەی حوکمداری یەکەی شێخ مەحموودیش بکەین. شێخ مەحموود زۆربەی ئەندامانی بنەماڵەکەی لە دەسەلاتداری یەکەی خۆیدا دامەزراندن[٨] ئینگلیزیش ئەمەی بە «خالێکی باش» لە ستراتیژیەتی ئایندەی خۆی لەناوچەکە دادەنا، لە ماوەی حوکمی راستەوخۆی ئینگلیز لە کوردستان دا، مێجەرسۆن لەو کەناڵەوە لەگەڵ عەقلیەتی «تەنویری» کوردەکانی سلێمان گەنگەشەی دەکرد.
ئینگیز، بۆ ئەوەی کۆتایی بە قۆناغی فەرمانداریی ناراستەوخۆی کوردستان بێنێ و حوکمی مەرکەزیەت بەسەر کوردستان بسەپێنێ هەنگاوی یەکەم مێجەر سۆنی لەجێ ی مێجەر نوئیل دامەزراند. مێجەر سۆن، لەپێش جەنگدا، بەناوی «میرزا غولام حسێن لە هەلەبجە و سلێمانی ماوەیەکی زۆر ژیابوو بەجۆرێ هەتا بەو ناوە ناسیاوێتی لەگەڵ شێخ مەحموودیش پەیداکرد، و[٩] لە ژێر راسپاردەی ولسن، مێجەر سۆن، گرینهاوس و دانلیس خەریک

بوون سلێمانی لەژێر دەسەڵاتی شێخ مەحمود دەربهێنن. شێخ مەحموود کە بەناراستەی ولسن کرابووە حوکمداری کوردستان بۆیە نامەیەکی بۆ ولسن نوسی:

«کورد داوای ئازادی ئەکات ئەگەر بەزووبەکی زوو ئەو مافەیان نەدرێتێ من ناتوانم بەڵێنی بەربەستنیان بدەم! جا، بەناوی خۆم و هەموو کوردەوە تکا ئەکەم، کە ردوشتی سیاسەتە ناڕەواکەتان، و ئەم پیاوە سیاسیانەی ئێستاتان بە پیاوی ژیر و تێگەیشتوو بگۆڕن»[1].

## ئیمزا شێخ محمود شوباتی ۱۹۱۹

بەقسەی ردفیق حلمی لە سەردەمی نوئیل وا هیچ کێشەیەک لە نێوان شێخ و نوئیل دانەبوود، بەڵام هەروەک وتمان، لە ئەزدری ئینگلیز، بوونی نوئیل لە سلێمانی قۆناغێک بوو، دامەزراندنی مێجەرسۆن بەئاراستەی ولسن بوود، چونکە ولسن خۆی یەکێ لەو ئینگلیزانەبوود لە گەڵ بێل باوەڕی بە حکومەت و دەولەتی کوردی نەبوود. لە ئەزدری شێخ، پاشگەزبوونەوەی ئینگلیز لە بەڵێنەکانیان، هیچی بۆ ئەو نەهێشتبۆوە تەنیا ڕاگەیاندنی ڕاپەرینی ئازادی نەبێ. ئەو سیاسەتەی ئینگلیز وای لە شێخ کرد بە هاوکاری مەحمود خانی دزلی لە ۲۲/مایس ۱۹۱۹ دەست بەسەر سلێمانی دابگرێ. هەروەها وەک د. میم کەمال ئۆقە دەنوسێ ساڵی ۱۹۱۹ بۆ ئینگلیز ساڵی نیگەرانی بوو، چونکە لەو ساڵەدا زۆر گەورە لێپرسراوی ئینگلیز بەدەست کوردان کوژران وەک کوژرانی کاپت بیرسن، کاپتن ئوللی، کاپتن سکۆت، کاپتن بێل[11] ئینگلیز لەرێگای بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی لەلایەک، بێ نیزامی سوپاکەی شێخ مەحموود، هەروەها کاریگەری «خیانەتی کوردی» لەلایەکی تر، بتوانێ دەست بەسەر سلێمانی دا بگرێ و شێخ مەحموودیش بەدیل بگرێ. لە پاش ئەو کاردساتە مێجەر سۆن لە سلێمانی، ئەدمۆندس لە کەرکوک، کاپتن های لە هەولێر و کۆلۆنیل لیچمان لە موسڵ ئەفەرد

سیاسی یەکانی تر، کە داوای حوکمی راستەوخۆیان دەکرد، هەولیان دا بیرۆکەی حوکمی مەرکەزیەتی راستەوخۆ بیوژیننەوە[١٢]. ئەو جۆرە حوکمە پێشتر گروپی ئیتحاد و تەرەقی پەیرەویان دەکرد. های وسۆن باوەڕیان وابوو کە فەرمانداری راستەوخۆ تاکە ڕێگایە بۆ حوکم کردنی کوردستان. بە حوکمی ئەوەی میجەرسۆن کوردی یەکی باشی دەزانی، بۆیە دەستی کرد بەگرنگی دان بەزمانی کوردی و کەلتوری کوردی لە ڕێگای دەرکردنی هەفتەنامەی «پێش کەوتن» توانی بووی زۆربەی رۆشنبیرانی سلێمانی لە خۆی گرد بکاتەوە بەمەش زەبرێکی تری کوسەدی لە پێگەی شیخ مەحموود دەدا لەناوچەکەدا هەروەها پرۆسەی بە مەرکەزیەت کردنی حوکمی ئینگلیزی لە کوردستان مسۆگەر تر دەکرد[١٣]

## ١-٢- میجەر نوئیل و کورد.

پێش ئەوەی میجەر نوئیل بێتە سلێمانی، لەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی دا وەک ئەفسەرێکی هەواڵگری بەریتانی لە ئیران لەناو کوردەکانی بەختیاری دا خەریکی هان دانی خێلەکانی کورد بوو لە دژی ئەلمانەکان[١٤]. ولسنی حاکمی گشتی ئینگلیز لە بەغدا لەباسی کارە خزمەتگوزاری یەکانی نوئیل بۆ دەولەتی بەریتانیا دەنوسێ: «سەرگوزشتە سامناکەکانی نوئیل (مخاطرات ویا مجازفاتی) کتێبێکی زۆر گەورە پڕ ئەکاتەوە..»[١٥] ئەو خزمەتانەی نوئیل بۆ دەولەتەکەی لەبەشی رۆژهەلاتی کوردستان کرد، وای لە ولسن کرد کە ئەمجارە بەرەو خوارووی کوردستان رەوانەی بکات.

هەر لەو پێناوەدا، لە ساڵەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی دا، نوئیل توانی بچێتە ناو کۆمەڵگای کوردەوە و پەیوەندی یەکی پتەو لەگەڵ سەرخێل و کاربەدەستانی کوردستان ببەستێت... کەسێکی وەک تۆفیق وەهبی، کە یەکێ لە لایەنگرانی ئینگلیز بوو، خۆی دەرسی کوردی بە میجەر نوئیل وتووە: لە ئاکام فێری کوردی بووە[١٦]. کەسێکی وەک رەفیق حیلمی، کە

ئەوسا لە سلێمانی مێجەر نوئێلی بینیوە لە زۆر بواردا باس لە لایەنە چاکەکانی نوئێل دەکا و هەتا دەگاتە ئەوەی رەخنەیەکی توندیش لە شێخی حوکمدار دەگرێ: «مێجەر نوئێل خۆی ناوی (حاکمی سیاسی) لێ نرا. لە بینایەی (مەکتەبی ئەعدادی) زەمانی تورکەکاندا دا ئەنیشت. لە سنوور بە دەر مەنگ و هێمن و شارەزا بە ئاداب و هەڵسان و دانیشتنی کوردەواری بوو. بێ ئەندازە حورمەتی حوکمداری ئەگرت و بۆ خۆی (کاتب)ێکی بچووک وە یان خزمەتکارێکیشی بەبێ ئەمرو رەزامەندی شێخ مەحموود دانەئەنا.. مێجەر نوئێل خەریکی چارەسازی گرانی و برسیەتی بوو، پەیتا پەیتا لە عەمبارەکانی کەرکوک لە بەغداوە شەکر و چاو و ئاردی سپی ئەگەیاندە سلێمانی، وە بەخۆڕایی بەسەر فەقیر و هەژار و مامورەکاندا بەشی ئەکرد.. نوئێل هەر بەمەوە نەوەستا، بەڵکو روپیە و (بانکنۆت) و قەدەرێکی زۆر لیرەی تورکی ئالتونیشی رژاندە سلێمانی و بەبێ دەس پێوەلەرزین بەسەر رەئیس عەشیرەتەکان و دەستە و دانیرەی حوکمدارا بڵاوی کردەوە..»[١٧]

لە پاش ئەوە، لە بەرامبەر دیسە سەر هەڵوێستی شێخ محمود کە بە قەد نوئێل خەریکی چارەسەرێکی باری بژێو و سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد نەبووە هەتا ئەگاتە ئەوەی دەنوسێ: حوکمداری کوردستانیش بەپێ ی هەوا ئەچوو بەرێوە. بەرۆژ لەگەڵ تاقمێک نۆکەر و دەستەدایەرە رووی ئەکردە دەشتی (کانیسکان) و بەسەیر و گاڵتە و گەپەوە رای ئەبوارد. بەهیوای ئەوە بوو کە (کات) تا سەر بەم چەشنە بچێت بەرێوە، خوا بە قودرەتی خۆی کوردستانی گەورەی بۆ دروست بکات و ئەویش (تاج)ی حوکمداری بنێتە سەر (سەر)[١٨]!

ئەحمەد خواجەی نوسەر و گەنجینەداری شێخ محمویش هەر لە بارەی نوئێلەوە دەنوسێ:

«لە پاش کۆبوونەوە و لێ دوانێکی زۆر و بەپەسەندی مێجەر نوئێل بریاردرا کە لە کوردستانەوە بۆ ئەوەی لە پاریس شەریف پاشا ببێت بە وێنەر

و نوێنەری کورد، و لە کۆمەڵی ناشتیدا داوای مافی کورد بکات لە سلێمانی یەوە. لەگەڵ نامەی گشتی (مضبطە)دا سەید ئەحمەدی بەرزنجی و ڕەشید زەکی کابان نێردران.[19].

لە قسەکانی ڕەفیق حیلمی و ئەحمەد خواجە دەفامرێتەوە، کە میجەر نوئیل کەسی خۆی لەگەڵ ئەوەبووە «کیانێکی کوردی» لەناوچەکەدا دامەزرێ: ئەمەش لەوانەیە بەهۆی چەند ئەگەرێکەوەبێت:

١- نوئێل زۆر خۆ شنوود بوود بەسیفات و ئەریتی گەلی کوردەوە.

٢- ئارەزووی لەوە بوود ئەویش ببێتە لۆرانس[20].

٣- دروست بوونی کیانێکی کوردی لەبەشی باکوری میسۆپۆتامیا لەبەرژەوەندی بەریتانیا دایە، چونکە خۆی باوەڕی وابوو کە نابێ عەرەبەکانی عێراق دەسەڵاتی موتلەقیان بەسەر کوردستان دا هەبێ[21]

ئەو سێ شیمانەیە لەگەڵ سروشتی ڕەوشتی کاری نوئیل هیچ دژایەتی یەک نانوێنن، چونکە ئەو وەک ئەفسەرێکی موخابەراتی لەناو کورد دا ڕێز و حورمەتی زۆری گیراوە چ لەناو کوردەکانی باشور یان بنەماڵەی بەدرخانی یەکان. هەروەها لۆرانس کە بە هانای عەرەبەکانی حیجاز هات و دەولەتی بۆ دروست کردن، لۆرانس ناوی لێ نرا «لۆرانسی عەرەب» هەروەها هەر لەهەمان دیدەوە لە ئەزەری تورکەکان، نوئیل بە «لۆرانسی کورد» ناوزەد دەکرا. سەبارەت بە ئەگەری سێ یەمیش، کە بەورایەی سەر ئێشەی بۆ بریار دروستکەرانی ئینگلیز و دروستکردووە بۆیە لە ئەزەری ئینگلیز نوئیل پێ ی لەبەری خۆی زیاتر ڕاکێشاوە بۆیە دەبێ لەسنوری خۆی بوەستێنرێ[22].

وێرای ئەمانەش، بەئەزەری نوئیل وەک ئەفسەرێکی موخابەراتی بەریتانی بەرژەوەندی وڵاتەکەی خۆی لەپێشەوەی هەموو شتێکەوە بووە هەتا ئەگەر گریان ئەو ئەگەرانەی سەرەوە هەموو تەعبیر لە خودی ڕای کەسیی نوئیل بکەن. لەبەرژەوەندی بەریتانیا ئەوسا وای دەخواست کە حوکمی ناڕاستەوخۆی کوردستان کۆتایی پێ هاتووە و دەبێ ناوچەکە ڕاستەوخۆ

ئینگلیز بەرێودی بیا، بۆیە هەر بۆ ئەوەی نوئێل بە «کەسێکی چاک» لەناو کوردا بێنێتەوە، ئەوا بەردو کوردستانی باکوریان هەنارد و میجەر سۆن یان لەجی ی ئەو دانا تا ئەوەی نوئیل بینای کردووە سۆن بەهەندێ بیانوودوە بیروخێنی. نوئیل لەبارەی ردوشی کوردستانی باکوردوە دەنوسێ:

«ولسن لە سێزدەی حوزەیرانی ۱۹۱۹ پێشنیاریکردبوو کە کوردستانێکی سەربەخۆ لە تورکیا دروست بکرێ بەڵام لەژێر رکێفی ئینگلیز بێ[٢٣] ئەو بەسەی کوردستان نەکەوت بوو ژێر رکێفی سەربازیی ئینگلیز هەروەها ئەو بەشەی کوردستان کە هەرچەنەبێ لەنەزدری ئینگلیزدوە ترسی بلاوبونەوەی شیوعیەتی لێ دەکرا. لەمەشدا ئینگلیز بە هەڵەدا نەچووبوون، چونکە مستەفا کەمال کە ئەو ناوچەیەی بەزۆر خستبووە ژێر کاریگەری خۆی و بەجۆرێ لە حکومەتی ئەستەنبۆل یاخی ببوو. سۆڤیەتی یەکان توانی بوویان مستەفا کەمال بۆ خۆیان دەستەمۆ بکەن. میجەر نوئیل-فایەق تاپۆی لەگەڵ خۆی برد بۆ ئەو بەشەی کوردستان لەوێوە لەگەڵ جەلادەت و کامەران بەدرخان بەهەندێ بەشی ئەو بەشەی کوردستان سورانەوە بەنیازی دوورخستنەوەی کورد لە تورکەکان و هەروەها سۆڤیتی پەیکان. مستەفا کەمال لە تەموزی ۱۹۱۹ کۆنگرەی ئەرزدرۆمی بەست و (۳۵) نوێنەری لە ویلایەتەکانی ئەرزدرۆم بەدلیس و وان و سیواس و تەرابزون بەشداری ئەو کۆنگرەیەبوون[٢٤] پاش ئەوەی کەمالی یەکان جێی خۆیان زیاتر لە کوردستان کردەوە لە ئەیلولی ۱۹۱۹ کۆنگرەیەکی تریان لە سێواس بەست. لە سەرچاوە تورکی یەکاندا، هەر بۆ ئەوەی لەلایەک وا پیشان بدەن کە ئینگلیز لەپەنای شۆرشەکانی کوردە هەروەها بۆ وروژاندنی کوردان بەلای خۆیان لەدژی ئینگلیز بانگاشەی ئەوە دەکەن، کەلەسەر دەمی کۆنگرەی سێواس دا، مێجەر نوئیل بەپالپشتی عەشیرەتە هاوپەیمانەکانی (کوردەکان) و هێزەکانی عەلی غالیبی حاکمی ئەرزدرۆم و پیاوی حکومەتی ئەستەنبۆل بریار بووە هێرش بکەنە سەر سێواس بۆ ئەوەی کەمالی یەکان لە نێو بەرن[٢٥] هەروەها لە بروسکەی فەرماندەی

کەتیبەی سیازدە و هێزە سەربازی یەکانی ناوچەکەدا هاتووە کە مێجەر نوئیل بۆ دروست کردنی پشێوی لە نێوان کورد و تورکدا هاتۆتە ناوچەکە، بەلاَم نوئیل خۆی لە یاداشتەکەیدا دەنوسێ:

«کوردەکان زۆرباش لەوە گەیشتبوون کە ئەگەر بڕۆن بۆ سیواس و سەرکوتی تورکە یاخی بووەکان (کەمالیەکان) بکەن بۆ کێشەی نەتەوایەتی یەکەی خۆیان هیچ سودێک نابینێ»[٢٦] ئەمە تێگەیشتنی کوردەکان بوو، کەچی نوئیل هەتا خۆی وەک خۆی دەنوسێ باوەڕی بەرێکخستنی کوردەکان نەبووە کە بۆ ئەوەی شەڕ لە دژی کەمالیەکان بکەن. چونکە وەک خۆی دەنوسێ.. من هەرگیز خۆم ناتکێنمە ئەو کێشە و دەنگ و باسانەوە[٢٧]

کەمال نۆقە لە کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ دا دەنوسێ پاش ئەوەی کوردەکان رازی نەبوون بەقسەی نوئیل شەڕی کەمالیەکان بکەن ئەوا نوئیل بەتوڕەیی قسەی لەگەڵ عەشیرەتەکان کردووە و پێ ی وتوون: ئێوە هێشتا تورکتان خۆش دەوێت و بێ ئەوانیش هیچتان پێ ناکرێ[٢٨]

ئەمە ڕای ئینگلیز و کەمالی یەکان بوو لەسەر چوونی نوئیل بۆ باکوری کوردستان، بەلاَم کە لە هەردوو ڕا ورد دەبینەوە هیچ کامیان بێجگە لە تاکتیک هیچی تر نین.

لە کتێبی «الرجل الصنم» کە ئەفسەرێکی تورک نزیک لە مستەفا کەمال نوسیویەتی هاتووە کە ئەفسەرێکی مەزنی ئینگلیز کە برای لۆرد کیرزۆن بووە لە ئەرزەرۆم لەگەڵ مستەفا کەمال کۆبوتەوە، بزاڤەکەی کەمالی یەکان هەربۆ ئەوە بوو هیچ بزاڤێکی میللی لە نێوان کوردەکانی باکور بەرپانەبێ. ئەمڕۆ ئینگلیز دەگەڵ حکومەتی ئەستەنبۆل یەک مال بوون، بۆیە هەر کە بیرسۆن لە (٤)ی نیسانی ١٩١٩ بەدەستی یەکێک لە کوردانی عەشیرەتی گۆیان کوژرا ئینگلیز وێرای ئەوەی بۆ ماوەی پێنج رۆژ گوندەکانی گۆیانی بۆردمان کرد، ئەوا پاشتر فشاریان خستە سەر عوسمانی یەکان تا هێزەکانیان بنێرن بۆ لێدان و کپ کردنەوەی ڕاپەریوەکان بۆیە عوسمانی یەکان هێزەێکیان ناردە

شەرناخ و گۆیان و جزیرە، بەشێکی ترشیان ناردە سەر ئەو عەشیرەتانەی لە نێــوان «نیــزیب» و «مــوسڵ» کــۆزبوونەوە تا ڕێگای پەیوەندیکردن بە عەشیرەتەکانی باکوریان لێ بگرن. لەبەر ئەوەیە ئینگلیزەکان متمانەیان بە تورکەکانیش نەبوو، لەوە دەترسان گەمەیەکی دوو لایەنە بکەن. بەباشیان زانی نوێنەرێکی خۆیان لەگەڵ هەڵمەتەکەدابێت. دوای ئەوەش لە (١٣)ی نیسان شالیاری جەنگی عوسمانی شاکر پاشا، فەرمانێکی بۆ دەسەڵاتدارانی سنوور دەرکـرد کـە ڕێگای هیچ بزاڤـێکی تری کـوردسـتـان نەدەن لەدژی ئینگلیــز[٢٩]. لە مەدا دەردەکەوێ کە ئینگلیز هەم لەگەڵ کەمالی یەکان هاوپەیمانی هەبوو، هەم لەگەڵ ئیتحادیەکان ئەستەنبۆل. لەو نێوەش سەرانی کورد لە باکور بـوونە دوو بەش هەندێ باوەڕیان بە حکومەتی ئەسـتەنبۆل هەرمابوو، بەڵکو بەبڕیارەکانی کۆنگرەی پاریس ڕازی بێ، بەتایبەتی ئەو کـوردانە لە ئەسـتـەنبـۆل بوون هەروەها هەندێ سـەرکـردەی عـەسـکەری و عەشیرەتی کوردی کەوتبوونە ژێر کاریگەری قسەکانی مستەفا کەمال[٣٠] ئینگلیز ئەمانەی هەموو بە «ترس» لەسەر بەرژەوەندیە کانی خۆی دەزانی بۆیە میجەر نوئیلی ناردە ئەو بەشەی کوردستان بۆ ئەوەی «کارێکی وا بکات کورد و تورک هەرگیز نەگەنە یەک و لە یەکتریان دوور بکاتەوە[٣١]. ئەمە و بەدوورنازانرێ کە میجەر نوئیل وەک هەندێ ئەفسەری دی ئینگلیز بۆ ئەوەش چوو بێ بۆ باکوری کوردستان بۆ ئەوەی قەناعەت بە عەشیرەتەکانی کورد بکات ناشــووب و ئاژاوە نەنێنەوە، چونکە لە کــۆنگرەی ئاشــتی پاریــس مافەکانیان دابین دەکرێ. ئاکامەکەش هەروا دەرچوو بەقەد چاوەڕوانی کۆنگرەی ئاشتی، تورکیا و عێراق هەردووک بوونە دەولەت و هەریەکە بەشێکی کوردستانی بەهێزی هاوپەیمانەکان بۆ خۆی دابڕی. لە باکوریش لە بریی ئەوەی بەقــەی ولــن کوردستانێکی سەربەخۆ دامەزرێ دادگایەکی سەربەخۆ دامەزرا بۆ دادگایی کردنی سەرانی کورد. هەرچی بەشی باشووریش بوو، ئەوا بەبڕیاری ئینگلیز و کۆمەڵەی گەلان کرا بە بەشێک لە عێراق.

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

(١) دێرک کینانی، کوردەکان و کوردستان، لەندەن- ١٩٧٠ چاپی ئینگلیزی؛ س. ج. ئەدمۆندز، کورد، ترک، عەرەب، چاپی عەرەبی.
(٢) بڕوانە، رەفیق حیلمی، یاداشت، بەرگی یەکەم.
(٣) ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی دووەم، سلێمانی ١٩٦٩، ل٧.
(٤) یاداشت، ل٦٠-٦١، چیم دی، بەرگی یەکەم، ل٢٠-٢١، کوردستان فی عهد السلام، ل٣٥-٣٦.
(٥) چیم دی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢.
(٦) سەلام، کوردستان چۆن داگیرکرا و دابەش کرا، هەولێر ٢٠٠، چاپی دووەم، ل٨٣.
(٧) یاداشت، بەرگی یەکەم، ل٦٢.
(٨) شێخ مەحمود، سەید عومەری مامی خۆی کردە موتەسەریف، حاجی سەید حەسەنی مامی دووەمی کردە حاکم سەرۆکی دەزگای شەرع، شێخ قادری برای کردە سەرۆکی گشتی سوپا و هێزی چەکدار هەتا سەید عەلیش کرا بوو بە لۆمەسەر.. بڕوانە، محمود الدره، القضیه الكردیه، بیروت ١٩٦٦، ص١٣٣
(٩) چیم دی، ل٣١.
(١٠) سەرچاوەی پێشوو.
(١١) د. کەمال نزقە، کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ، هەولێر ٢٠، ل٢٣.
(١٢) د. عثمان علي، فتره الحكم المباشر ١٩١٩-١٩٢٠ اداره الميجر سون في جنوب كردستان، لندن-١٩٩٩، ل٢.
(١٣) سەلام، پێش ئەوەی ئینگلیز دەولەتی عێراق دامەزێنی حکومەتێکی کوردی لە سلێمانی دامەزراندبوو، برایەتی رۆژی ٢٣/٨/٢٠٠٠.
(١٤) یاداشتەکانی میجەر نوئیل لە کوردستان، وەرگێڕانی حسێن جاف و حسێن ئیزکەمچاری، بەغدا-١٩٨٤، ل٧.
(١٥) یاداشت، ل٦١.
(١٦) سەرچاوەی ژمارە (١٥)، ل٧.
(١٧) یاداشت، ل٦٣-٦٤.
(١٨) سەرچاوەی پێشوو.
(١٩) چیم دی، بەرگی یەکەم، ل٢٢.
(٢٠) سەرچاوەی ژمارە (١٥)، ل٩.
(٢١) د. کەمال نزقە، سەرچاوەی پێشوو.
(٢٢) سەرچاوەی پێشوو، ل٢١.
(٢٣) سەرچاوەی ژمارە (١٥)، ل١٢.
(٢٤) سەرچاوەی ژمارە (٦).
(٢٥) د. کەمال، ل٢٠.
(٢٦) سەرچاوەی ژمارە (١٥)، ل٨٠-٨١.
(٢٧) سەرچاوەی پێشوو، ل٨١.
(٢٨) د. کەمال، ل٢١.
(٢٩) کامەران مەنتک، کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەولەتی و ناوچەییدا ١٨٩٠-١٩٣٢، سلێمانی ٠٠٠، ل٢٤٠.
(٣٠) سەرچاوەی ژمارە (٦).
(٣١) سەرچاوەی ژمارە (٢٩)، ل٢٤٠.

## ئۆزدەمیر و مەسەلەی کورد
## ١٩٢٣-١٩٢٢

**پێشەکی**

گروپی ئیتحاد و تەرەقی لە دە ساڵی حوکمیان ١٩٠٨-١٩١٨ دەوڵەتی عوسمانی یان بەرەو چارەنوسێکی تاریک برد. ئەو گروپە بەناوی «دەستورخوازی» و «مەشروتیەت» توانیان پاڵپشتی هەندێ لە سەرکردەکانی کورد و گەلانی دی بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن؛ بەڵام تەمەنی ئەو پەیوەندی یە دەگەڵ کوردان زۆری نەخایەند، ئەوەبوو هەر لەپاش شوێن پێ توند بوونیان کەوتنە ویزەی سەرکردەکانی کورد و قەدەغەکردنی رێکخراو ویانە و رۆژنامەی کوردییەکانەوە. لەگەڵ ئەوەی ئەو گروپە هیچ پەیوەست نەبوون بە «ئیسلامەوە» ئەوا لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانی دا بەناوی «جیهادی پیرۆز» لە دژی «کافرانی هاوپەیمانەکان» ماڵوێرانی یەکی گەورەیان بەسەر کورد هێنا. ناکامی جەنگیش بەشکستی ئەوان تەواو بوو. ئاگربەسی مودۆرۆس تەواو دەست بەرداربوونی ئیتیحادیەکانی دەگەیاند لە زۆربەی شوێنە ستراتیژیەکانی دەوڵەتی عوسمانی دا. هەربەپێ ی ئەو ئاگر بەسە، بێجگە لە سلێمانی، ئەوا شارەکانی دی باشوری کوردستان وەک کەرکوک، هەولێر و موسڵ داگیرکران، بەجۆرێ شاری هەولێر و موسڵ لەدوای ئاگر بەسەوە داگیرکران. حکومەتەکەی ئەستەمبول تەواو شاری ئەستەمبۆلیشی لەژێر دەستانەبوو. سەبارەت بە کوردستان، ئەوابەشی باشور بەتایبەتی سلێمانی و دەوروبەری بەپێ ی رێککەوتنی شێخ محمود و ئینگلیز حوکمداری یەکی کوردی لێ هەبوو. هەرچی بەشی باکور بوو، ئەوا لە ناکامی هەرەسی روسیای قەیسەری و سەرکەوتنی بەلشەوی یەکان ئەوا ناوچەکە بۆ شایی یەکی ئیداری لێ دروست ببوو. لەو کاتەدا مستەفا کەمال پاشا لەژێر راسپاردەی حکومەتی ئەستەمبۆل بەرەو ناوچەکە چوو. لەوێ بەهاوکاری عەشائیری کوردی، مستەفا کەمال توانی شوێن پێ ی خۆی بکاتەوە بەتایبەتی لە دوای کۆنگرەی ئەرزەرۆم و سیواس. ئەو دوو کۆنگرەیە، بەرایی بنەماکانی «میساقی میللی» تورکی دارشت. لەپاشان هەر ئەو میساقە

میللی یه بوو به بەرنامەی ئەنجومەنی باڵای نەتەوەیی تورکی و حکومەتی نەتقەرد.

### ۱-۱- ئەگەرەکانی سەرکەوتنی بزافی کەمالی یەکان:

بەحوکمی ژیانی هاوبەشی کورد و تورک بۆ ماوەی چەند سەدەیەک، ئەوا کەمالی یەکان باش عەقلیەتی خێلەکی کوردیان خوێندبۆوە. ئەو پێکهاتە خێلەکی یەی عەقلیەتی عەسکەری ئەوسای کوردی، کە بەرژەوەندی کەسیی خێلی لە پێشەوەی بەرژەوەندی باڵای نەتەوە دا دەنا، دەستەمۆکردنی کارێکی دژوار نەبوو. ئەمە و نسکۆی شۆرشی شێخ و دەردەبەگەکانی کورد لە سەدەی نۆزدەهەمدا زیاتر وای لە سەرکردە خێلەکی یەکانی باکور کرد کە هاوکاری کەمالی یەت بکەن. ئەمە و سەقامگیرکردنی بنکەی «شۆرشی کەمالی یەت» لە کوردستانی باکور فاکتەرێکی سەرەکی بونیادنانی بزاڤێکی نوێ بوو لە ناوچەکەدا. دینە مۆی بەرایی ئەو بزاڤەش «دین» بوو، چونکە لەلایەک ئینگلیز و فەرەنسا زۆربەی دەوڵەتی عوسمانی یان داگیرکردبوو، هەروەها یۆنانیش هەر بە ناراستەی هاوپەیمانەکان توانی بووی ئەزمیر داگیر بکات[1] ئەو هەموو هێزەش «غەیرە دین» بوون، بۆیە بە گوێرەی عەقلیەتی ئەوسا «پاراستنی دین» لە پێش «رزگاری نەتەوە» بوو. بەو پێوەدانگە دیاگۆزی یە کەمالی یەکان توانیان بە تەواوی متمانەی سەقامگیربوونی خۆیان بۆ ئایندە مسۆگەر بکەن. فاکتەری کورد ئەوسا تەواو لە بەرژەوەندی کەمالی یەکان دا بوو، بەلام وەنە بێ کەمالی یەکان توانی بیان تەنیا کورد بۆ لای خۆیان کێش بکەن بەڵکو توانیان سۆڤیەتیش بۆ لای خۆیان کێش بکەن. سۆڤیەت زەنی وا بوو کە کەمالیەت بزاڤێکی «ئەنتی ئیمپریالیزمی» یە، دەکرێ وەک ئامرازێک بۆ پاراستنی سنوری دەوڵەتەکەیان بەکاریان بێنن. ئەمە و زۆر را هەیە کە کەمالی یەکان دەسکردی ئینگلیز بن، ئینگلیز دروستی کردبن بۆ ئەوەی بیانکەن بە ئامرازێک کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراستی یان پێ یەکلا بکەنەوە[2]. لەو باوەردیەوە ئیسماعیل بەشکچی دەنووسێ:

**«لە ساڵانی ۱۹۲۰ کێشەی کەمالیستەکان لەگەڵ ئینگلیزەکان لە سەرزەوتکردنی پارچەیەکی گەورەتر بوو لە کوردستان. ئەم کێشەیە**

**کێشەیەکی کۆلۆنیالی بوو، ئەم کێشەیە لە سەر بە تورک کردن و کۆلۆنیالیکردنی کوردستان بوو. بۆیە کێشەی کەمالیستەکان هیچ ناوەڕۆکێکی دژ بە کۆلۆنیالیستی و ئیمپریالیستی نەبوو»[٣]**

ویرای ئەمەش، سۆڤیەت یەکەم دەولەت بوو نوێنەری کەمالی یەکانی لە باکو پێشوازی کرد و دانی بەو بزاڤە نا[٤] لەمەش زیاتر لە سالانی ١٩٢ چەک و تەقەمەنی یەکی زۆری بە کەمالی یەکان دا[٥] ئەو سیاسەتەی ئەوساش لەبەرژەوەندی کەمالی یەکان دا بوو. بەلام لەسەر حیسابی خەباتی رزگاریخوازی کورد و ئەرمەن بوو[٦] ئەمە و ردفیق حیلمی لە یاداشتەکەیدا ئەو ئەگەرانەش دەخاتە ڕوو کە رۆلی گرنگیان بینیوە لە سەرکەوتنی کەمالی یەکاندا:

١- جیابوونەوەی فەرەنسا و ئیتالیا لە سیاسەتی ئینگلیز کە دەربارەی تورک و یۆنان لەسەری ئەرۆیشت.

٢- دەرچوونی لەشکرەکانی فەرەنسا لە چەند ولایەتێکی داگیرکراوی تورک و بەجێ هێشتنی ئەم ویلایەتانە بۆ لەشکرەکانی مستەفا کەمال.

٣- بەجێ هێشتنی چەکەکانی لەشکری فەرەنسا لە کلیکیا بۆ لەشکری مستەفا کەمال بەبێ پوول و پارە.

٤- یارمەتی سیاسی و ئەدەبی ئیتالیا بۆ تورکیای تازە و فرۆشتنی چەکی جەنگی بە حکومەتی مستەفا کەمال[٧]

ئەمە و بێ دەسەلاتی و بێ هەیبەتی حکومەتی ئەستەمبول لە ئاست داگیرکاری بەریتانی و هەروەها کەوتنی وەزارەتی وەنیزەلوسی سەرەک وەزیرانی یۆنان و هاتنی قوستەنتین پاشا ئەگەری دی بوون تەواو لە بەرژەوەندی کەمالیەت دا بوون. هۆکاری کوردی و هاوکاری مادەی و مەعنەوی سۆڤیەت و فەرەنسا و ئیتالیا وایان لە کەمالی یەکان کرد کە بتوانن هەم کۆتایی بەداگیرکردنی یۆنانی لە ئەزمیر بێنن هەم دەست بەسەر ئەستەمبوڵ دا بگرن. لە پاشان مستەفا کەمال لە مەراسیمی کردنەوەی ئەنجومەنی بالای تورکی دا لە ئامانجی ستراتیژی کەمالیەت دواو جەختی لەسەر ئەوە کرد کە دەبێ سوپای کەمالی یەکان بنێردرێ بۆ ئەو ناوچانەی لە میساقی میللی دا بە بەشێک لە تورکیا دانراون لە وتارەکەی دا مستەفا

کەمال وتی: ئامانجی یەکەم و سەرەکی ئێمە ئەوەیە سنوری خوارووی خۆمان دیاری بکەین کە لە باشوری ئەسکەندەرۆنەوە بەرەو رۆژهەلات دەست پێ دەکات، کە وابێ سنوری دەولەتی ئێمە موسلّ و سلێمانی و کەرکوک دەگرێتەوە، ئەوە سنوری نیشتمانی یەکانی دەولەتی ئێمەن[8] هەر لەبەرایی کەمالی یەکان داوای گەراندنەوەی باشوری کوردستانیان دەکرد، هەر لەو روانگەوە یەکێ لە ئەفسەرانی تورک بەناوی «فازل ئەفەندی» بەناو بەشی کوردستانی ژێر دەسەلاتی سمایل ئاغا -سمکۆی شکاک- هاتە رەواندز[9].
هاتنی ئەو هێزەی سەربازی یەی تورک، ئینگلیزی هەراسان کرد و دەستی کرد بە تۆپبارانکردنی رەواندز و دەوروبەری.

## ۱-۲- رەوشی باشوری کوردستان بەر لە هاتنی نۆزدەمیر:

لە پاش ئەوەی ئینگلیز بەزەبری هێز و خیانەتی (مشیری حەمەی سلێمانی)، و هەندێ لە خزمانی شێخ محمود توانی دەست بەسەر سلێمانی دا بگرێتەوە. بیرۆکەی «راستەوخۆ حوکمی کردنی» ناوچەکەی پەیرەوکرد[10] کەسێکی وەک میجەر سۆن توانی بە دبلۆماسیەتی خۆی لە رێگای رۆژنامەی «پێش کەوتن» بزاڤێکی رۆشنبیری لە سلێمانی بەرپابکا و زۆر لە نوسەر و رۆشنبیرانی ئەوسا لە خۆ نزیک بکاتەوە، بەلام سیاسەتی داگیرکارانەی ئینگلیز نەیتوانی هەموو سەرکردەکان دەستەمۆ بکات، ئەگەر چی توانی شێخ عبدالکریم و سەید تەهای شەمزینی لە بەرەی دژ بە رەوتی شێخ محمود کۆبکاتەوە، بەلام دوایی بۆ ئینگلیزیش دەرکەوت کە کەسانی وەک شێخ عبدالکریم و سەید تەها و هەندێ سەرەک خێلی دی ناتوانن کۆمەلی کورددەواری رازی بکەن[11] لە دەڤەری بارزان یش لەنێوان ئەفسەرانی ئینگلیز و شێخانی بارزان کێشە هەبوو، بەجۆرێ هەر لە پاش راپەرینی شێخ مەحمود، لە یەکی تشرینی دووەمی ۱۹۱۹ لە گوندی «بیرا کەپرا» لە نێوان شێخانی بارزان و ئینگلیز رووبەرووبونەوە رویدا[12] تورکەکانیش هەر بۆ ئەوەی پیلانەکانی ئینگلیز لە باشور سەرنەگرێ و ئەوان خۆیان دەست بەسەر ناوچەکەدابگرن، ئەوا ئەوانیش لە باکور خەریکی جۆشدانی کوردان بوون لە دژی ئینگلیز لە زستانی ۱۹۱۸-۱۹۱۹ ئەنودر پاشا هاتە وان هەندێ دیدار

و پەیوەندی لەگەڵ ئاغا و ریش سپیانی ناوچەکە کرد بۆ ئەوەی لە دژی ئینگلیز بەکاریان بێنێ[١٣]. ئینگلیزیش لەرێ ی خۆیەوە بەدوای ئەو سەردک خێلانە دەگەڕا کە گوێ رایە لێ سیاسەتی ئینگلیز نەبوون. لەمەش زیاتر، بۆ ئەوەی کێشە لە نێوان ئاشوری و کوردان بنێتەوە، ئینگلیز بەبیانووی گەراندنەوەی ئاشوریەکان بۆ ولاتی خۆیان، ئەوا ئەو ئاشوریانەی لە دژ بارزانی یەکان بەکارهێنا، لە ئاکامیش زەرەر و زیانێکی رۆحی و ماددی زۆر بەبارزانی یەکان کەوت[١٤]. لە راپۆرتی بەریتانیا بۆ کۆمەڵەی گەلان ١٩٢-١٩٢٣ هاتووە کە ئەو کارەی ئینگلیز وای لە کوردان کردووە کە باوەڕیان زۆر کەمتر بێ بە ئینگلیز.

بەمجۆرە پەراگەندەبوونی هەندێ سەردک خێلەکانی کورد و نانەوەی ئاژاوەی بەردەوامی ئینگلیز لە دەڤەری پشدەر و سلێمانی و بارزان، دەرفەتێکی لە باری رەخساند بۆ ئەوەی تورکەکان جارێکی تر بە «سیاسەتێکی تر» بتوانن کوردان بۆ بەرژەوەندی سیاسەتی خۆیان دەستەمۆ بکەن.

## ١-٣- هاتنی ئۆزدەمیر بۆ باشوری کوردستان:

### ١-٣-١- کەسایەتی ئۆزدەمیر:

ئۆزدەمیر ئەفسەرێکی کەمالی بوو. ناوی خۆی عەلی شەفیق بوو. بەردگەز لە چەرکەسی یەکانی میسر بوو. دەرچووی ئەکادیمیای عەسکەری بوو. پلەی بوو بە کۆلۆنیل. د. کەمال مەزهەر لە باردیەوە دەنوسێ: «ئۆزدەمیر پاشا ئەفسەرێکی گەورە و لێهاتووی تورک و لایەنگری مستەفا کەمال بوو. ئۆزدەمیر نازناوی بوو. ئەگینا خۆی ناوی عەلی شەفیق و بەرەگەز میسری بوو»[١٥] سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئۆزدەمیر لە حوزەیرانی ١٩٢٢ هاتۆتە کوردستان. رەفیق حیلمی لە بارەی کەسایەتی ئۆزدەمیر و کروپەکەیەوە دەنوسێ: لە ڕواڵەتدا خۆی زۆر بە دیندار نیشاندەدا ئەوەی لە گەلی بوون نەک لە «مەفرەزە»یەکی عەسکەری بەڵکو زۆرتر لە کومەڵە «چەتە»یەک ئەچوون، لە چوار پێنج زابت و چەن ئەفەرێکی تورک بەولاوە ئەوانیتری ئەم چەتەیە هەموو کورد بوون. لە خەلقی کەرکوک و هەولێریش هەندێکیان لەوانە لەگەڵ

بوو کە بەتورکی خۆیان قسەیان ئەکردو نەیان ئەزانی کوردن و یان وایان بەجوان ئەزانی کە بێن بە تورک ئۆزدەمیر بەراستی زیرەک و خوێندەوارێکی وریا بوو. تەبیات و سروشتی کوردەکانی ئەزانی و لە دەستوری عەشایەری دا ئاگەداری هەبوو. لە سیاسەتی هەڵسووراندنی عەشایەرا گەلێ لە حاکمی سیاسی یەکانی ئینگلیز باشتر سەرکەوتبوو تەبیات و میزاجی سەرەک عەشیرەتەکان تێ گەیشت بوو و زۆری ئەو سەرەکانەی کرد بوو بە «ئەموسیلە»ی دەستی جگە لەمانەشی لە یارمەتی ئەهالی و عەشایەری ئەو ناوەدا چ بەچەک و چە بە ئازووقە و پارە لە ئینگلیزەکانی تێ پەڕاند بوو[١٦].

ئۆزدەمیر بە جۆرێ کاری لە عەقلیەتی عەشایەری کورد بوو، بەجۆرێ کەسێکی وەک صالح زەکی -کە فەرماندەی گشتی و رەهبەری جەنگی چەتەیی سوپایی و عەشایەری کورد بوو لە بەردەم شێخ محمود لە پێشوازی کردنی ئۆزدەمیردا ئەستێرە و تاجەکەی سەرشانی (نیشانەکانی کوردستانی)ی کردەوە و خستیە گیرفانی[١٧].

## ١-٣-٢- ئامانجی ستراتیژی ئۆزدەمیر لە کوردستان:

کەمالی یەکان باوەڕیان بە «ئەنجومەنی میللی» هەبوو بۆ ئەوەی سیاسەتەکەیان لە ناوچەکە بسەپێنن. هەروەها بە حوکمی ئەوەی ململانێی ئینگلیز و کورد بێجگە لە چوارچێوە کۆلۆنیالی یەکە، ئەوا ململانێ یەکی لە ڕواڵەتدا «دین»یش بوو. ئەو فاکتەرە زۆر لە بەرژەوەندی کەمالی یەکان بوو. لە ئەرشیفی سیاسەتی دەرەوەی روسیا دا نامەیەکی کۆکس هەیە بۆ چەرچل بە مێژووی ١٩٢٢/٥/٥ (بەواتای پێشهاتنی ئۆزدەمیر) باس لەوە دەکا کە کەمالی یەکان دەستیان کردووە بە بڵاوکردنەوەی چەند بڵاوکراوەیەک بەناوی «بەیاننامەی یەکێتی ئیسلامی» ئەو بەیاننامەیە دژ بە شا فەیسەل بوو. لە بەیاننامەکەدا هاتووە کە «دەسەڵاتی فەیسەل» شەرعی نی یە دژ بە بنەماکانی خەلافەتە... سەرۆکی بەرەی «جەزیرە» داوا لە کوردان دەکات بۆ «جیهادی پیرۆز» لە دژی ئینگلیز شەر بکەن هاوکات دەگەڵ ئەو بەیاننامەیەدا، ئۆزدەمیریش نازناوی «سەرۆکی راپەرینی نیشتمانی» لە خۆ

نابوو[18] ئەحمەد تەقی، کە ئەفسەرێکی یەدەکی سوپای عوسمانی بوو[19]، یەکێ لەو کوردانە بوو کە کەوت بووە ژێر دیماگۆژیەتی کەمالی یەکان، لەیاداشتەکەیدا دەنووسێ هەر کە ئۆزدەمیر گەیشتە ڕەواندز بەپێی دەستوری ئەو کاتەی کەمالی یەکان «ئەنجومەنی میللی» دروست کرا بۆ ئیدارەکردنی شار بەم جۆرەی خوارەوە:

١- شێخ ڕەقیب- سەرۆکی ئەنجومەن.
٢- ئەحمەد تەقی- جێگری سەرۆکی ئەنجومەن.
٣- شێخ ئەمین- ئەندامی ئەنجومەن.
٤- شێخ جەوادی سەلان- ئەندامی ئەنجومەن.
٥- غفور خانی سەرچیا- ئەندامی ئەنجومەن.
٦- خدر ئاغای سەرچیا- ئەندامی ئەنجومەن.
٧- ئەحمەد بەگی بگۆک- قائیمقامی ڕەواندز.
٨- نوری باوێلێ ئاغا- قوماندانی ژاندرمە.
٩- شەوکەت ئەفەندی- سەرۆکی شارەوانی.

هەموو تەشکیلاتی هێزی میللی ڕێکخراو، چەک و جبەخانەیان بەسەردا دابەشکرا[20]. پێ ڕەش لە کتێبی «العراق دولە بالعنف» باس لە کاریگەری پرۆپاگندەی تورکەکان لەسەر گوندییەکان و ڕەش و ڕووتی کورد دەکا، بەڵام هەریەک لە ڕەفیق حیلمی و ئەحمەد خواجەی نوسەر و گەنجینەداری شێخ محەمود وا باس لە کاریگەری دبلۆماسیەتی ئۆزدەمیر دەکەن کە بەجۆرێ ناوچەی ڕەواندز و کۆیە و ڕانیە بوونەتە شوێنی ئەو کەسانەی دژە ئینگلیزن. کەسانی وەک (تاهیر ئەفەندی ئەمینی سەرکاتبی ملوکانە و سەید عەبدوڵلای حاجی سەید حەسەنی ئامۆزای شێخ محەمود و ئەحمەد تەقی ئەفسەری یەدەکی سوپای عوسمانی، سەید ڕەزا ئەفەندی یوزباش لە سوپای عوسمانی، سەید ڕەئوف ئەفەندی و زۆر پیاوانی تری ناسراو دەست ڕۆیشتوو لە تورک خواهەکانی ناوچەکەبوون[21] ئەو کەسانەی لایەنگری تورک بوون بە تورک خواز یان جل خوار ناسراو بوون، ئەوانە ڕەواندزیان کردبوو بە پەناو بە هێلانەی هیوا. لەمانە هەندێکیشیان بەتەواوی بوون بە خزمەتکاری (ئۆزدەمیر) و بۆجی بەجێ کردنی مەبەستی تورکەکان کەوتنە هات و چۆ.

بەنهێنی و یا ئاشکرا ئەهاتنە سلێمانی و کۆیێ و رانیە و هەولێر و کەرکوک، بەناو عەشایەرا ئەگەڕان و ئەچوونەوە رەواندز نامە و بەیان و راسپێری «نوزدەمیر»یان بەم خەلقەوە ئەگێرا و باس و هەواڵی شارەکان و عەشایەریان بۆ «ئۆزدەمیر» ئەبردەوە[٢٢]

عەشیرەتی جەباری لە نزیکی چەمچەماڵ لە دژی ئینگلیز راپەڕین لە باشان عەشیرەتی هەمەوەندیش راپەڕین و دوو ئەفسەری ئینگلیزیان کە کابتن مکند و بوند بوون کوشت[٢٣] کەریم بەگی فەتاح بەگی سەرەک عەشیرەتی هەماوەند لە پاش کوشتنی ئەو دوو ئەفسەرە و «غەفور خەجێ»ی پیاوی «بوند» بەرەو رەواندز چوو. رۆڵی عەباسی مەحموود ئاغاش لە پەوکردنی دەسەڵاتی ئۆزدەمیر لە کوردستان لە کەریمی فەتاح بەگ کەمتر نەبوو. عەباس ئاغا قەزاکانی رەواندز و رانیە و بەشی زۆری پشدەری بەرێوەدەبرد[٢٤]

لە ژێر فشاری ئۆزدەمیر و خێلەکانی کورد، ئینگلیز ناچاربوو لە سەرەتای ئەیلولی ١٩٢٢ لە رانیە بکشێتەوە. پێشرەوی ئەو هێزە بەرەو قوڵایی باشوری کوردستان دەچوو[٢٥] بە گوێرەی ئەدمۆندز خۆی هێزەکانی ئۆزدەمیر و کورد لە ئەیلولی ١٩٢٢ گەیشتە دەوروبەری سلێمانی. لە بەرامبەر ئەو هێرشەدا، ئینگلیز بڕیاریدا دەسبەجێ سلێمانی چۆڵ بکا، هەر بەو بۆنەیەو، لە یەکی ئەیلولی ١٩٢٢ فڕۆکەیەکی بەریتانی لە نزیک سلێمانی نیشتەوە بۆ ئەوەی کاربەدەستە مەدەنی و عەسکەری یەکانی رزگار بکات و لە پاش خۆی خەزێنە و ژمارەیەکی زۆری تفەنگ و کەرستەی سەربازی بەجێ هێشت. ژەنیرال فریزەر شیمانەی هێرشێکی هاوبەشی کوردی و تورکی بۆ سەر هەولێر و ئاکرێ لە یەک کاتدا دەکرد[٢٦] ئەو داگیرکردنە ناراستەوخۆیە کەمالی یەکان، ئینگلیزەکانی ناچار کرد کە جارێکی تر بیر لە حوکمی ناراستەوخۆی کوردستان بکەنەوە، ئەویش بەگەڕاندنەوەی شێخ مەحمود. ئەدمۆندز لە کتێبەکەیدا بەراشکاوی دان بەوە دەنێ کە مەبەست لە گەڕاندنەوەی شێخ محمود تەنیا بۆ بەربەچ دانەوەی پێشرەوی تورک بووە لە ناوچەکەدا. ئەوەبوو ئینگلیز بەناچاری شێخ محمودیان گەڕاندەوە و بەڵێنیان پێ دا کە دەیکەنەوە بە حوکمداری کوردستان. لە کۆتایی ئەیلولی ١٩٢٢ شێخ محمود بە یاوەری

میجەر نوئیل گەرایەوە سلێمانی. لایەنگرانی شێخ محمود هاتنەوەی شێخیان بە سەرەتای «سەربەخۆیی» کوردستان دادەنا، میجەر نوئیل یش وەک راوێژکار تەماشایان نەدەکرد بەڵکو وەک «کۆنسوڵ»ێک لە نێوان شێخ و کۆمیسیاری باڵا لە بەغدا. شێخ محمود لە ( ١ )ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ لە رۆژنامەی بانگی کوردستان ژمارە ( ١٠ ) ناوی سەرەک وەزیر و وەزیرانی حکومەتی نوێ ی کوردستانی بە مجۆرە راگەیاند[٢٧]:

١- عبدالقادر سعید- سەرۆک وەزیران و سوپا سالار.
٢- شێخ محمد غریب- وەزیری ناوخۆ.
٣- میر لیوا مستەفا پاشا- وەزیری مەعاریف.
٤- عەبدولکەریم عەلەکە- وەزیری دارایی.
٥- شێخ عەلی ئەفەندی- وەزیری شەرع و داد.
٦- ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ- وەزیری گومرک.
٧- سەید ئەحمەد بەرزنجی- وەزیری ئاسایشی گشتی.
٨- میر لیوا صدیق پاشا- وەزیری پشکێنەری گشتی.

لەگەڵ راگەیاندنی حکومەتدا، شێخ نازناوی «حوکمدار» بۆ خۆی هەلبژارد، بەلام پاش مانگێک نازناوی «مەلیک»ی لە خۆ ناو پارە و پولی دەرکرد و کەوتە کۆکردنەوەی باج و زمانی کوردی کردە زمانی رەسمی «حکومەتی کوردستان» و دەزگای رۆژنامەگەری کوردی دامەزراند[٢٨] بەلام کەس- نە بریتانیا وە نە تورکیا دانیان بەو حکومەتە نەنا. ئینگلیز و بەغدا چاوەڕێ ی ئەوەیان لە شیخ دەکرد کە سوپای نوزدەمیر لە کوردستان بەدەربنێ میجەر نوئیل دەیەویست هەرسێ سەرکردەی کورد شیخ محمود و سمکۆی شکاک و سەید تەهای شەمزینی لە بەرەیەک لە دژی تورکەکان کۆبکاتەوە، بەلام هەر یەک لە شیخ محمود و سمکۆ رازی نەبوون بەبێ مەرج لە دژی تورک بجەنگن. هەرچی سەید تەها بوو لە مانگی یازدەی ١٩٢٢ بە هێزێکەوە هێرشی کردە سەر سوپای نۆزدەمیر لە رەواندز، بەلام هێرشەکەی فەشەلی هێنا ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەیبەتی مەلیکی کوردستان زیتر ببێ[٢٩]. شێخ هەر داوای لە ئینگلیز دەکرد کە دان بە مەملەکەتەی بنێن و ئازادی و سەربەخۆیی کورد بسەلمێنن بۆ ئەوەی تورک لە ناوچەکە دەربکەن. لە

۱۹۲۲/۱۱/۱۵ میجەر نوئیل نامەیەک بۆ شێخ محمود دەنێرێ و دەنوسێ: لەگەڵ کۆمیسیاری باڵا ئاخاوتم بۆم دەرکەوت، کە ئێستا ناتوانرێ بابەتی سەربەخۆیی کوردستان دیماهی پێ بهێنرێت، ئەگەر شا فەیسل و حکومەتی عێراق رازی نەبن[٣] ئەحمەد خواجە و رەفیق حیلمی- کە دوو کەسی نزیک شێخ بوون- دەنووسن هەتا شێخ تەواو لە ئینگلیز بێ نومێد نەبوو بەڵێنی نەدا کە هاوکاری ئۆزدەمیر بکا. تورکەکانیش وەک د. کەمال مەزهەر دەنووسێ: لەگەڵ شێخ محمود دەستپاک نەبوون، دەیانویست بیکەنە داردەستێک بۆ جێبەجێ کردنی مەبەستەکانی خۆیان[٣١] هەر بۆ فریودانی رای گشتیش، وەک کۆمیسیاری باڵای بەریتانی لە نەستانە لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوە دەنوسێ کە لە ٢٩ی مارتی ١٩٢٢، لە نێو ئەنجومەنی باڵای ئەتەوایەتی تورکی، گفتوگۆ لەسەر دۆزی کورد کراوە. لیستێکی یاسایی کارگێڕێتی تورک بۆ کوردستان دانراوە، ئەو لیستەیە بەندی تایبەتی تیابوود بۆ ئەوەی کورد خۆی بەڕێوەبەرێ و زمانی کوردی ببێتە زمانی فێرکردن بەو مەرجەی ئەمە نەبێتە بنەمایەک بۆ ئەوەی کورد لە ئایندەدا داوای سەربەخۆیی تەواو بکەن[٣٢]. هەر لەسەر ئەو بنەمایە، ئۆزدەمیر مامەڵەی دەگەڵ شێخ محمود دەکرد. لەو نامەیەی کە ئۆزدەمیر لە ۱۹۲۲/۱۱/۳ بۆ شێخ محمودی ناردووە، نوسیویەتی: بۆ ئەوە هاتووین و تێدە کۆشین کە تا سنورەکانی شاخی حەمرین بگرین، ئەو جێگایانە داگیردەکەین کە بە وڵاتی تورک دەژمێردرێت و لە دەستوری میللی تورکدا نیشان دراوە[٣٣]. بەر لەو مێژووەش، هەر پێش ئەوەی شێخ محمود بگەڕێتەوە سلێمانی، ئۆزدەمیر لە نامەیەکدا تەواو ئامانجی ستراتیژی خۆی لە باشوری کوردستان بۆ شێخ قادری برای شێخ محمود دەردەبڕێ:

«شێخ، دەبێ باش بزانن لیستی ئەو خاکانەی کە لە پەیمانی میللی (میثاقی میللی) مان دانراوە، نابێ لەژێر چنگی بێگانەدا بمێنێتەوە من بۆ ئەوە هاتوومەتە کوردستان ئەم راستەقینە لە برا خۆشەویستەکانی ئێمە و هاوپەیمانەکانمان بگەیەنم، تا وەکو کوردەکانی برای دین و دۆستی دێرینمان نەبنە گوری سیاسەتی ئینگلیزە ناپاکەکان و بەهاندانی ئەوان کۆسپ و تەگەرە نەخەنە رێگامان»[٣٤]

ئەمە و وەک وتمان، مستەفا کەمال هەر لە مەراسیمی کردنەوەی ئەنجومەنی باڵای نەتەوایەتی تورکدا بەراشکاوی رایگەیاند کە ویلایەتی موسڵ بەشێکی جیانەکراوەی وڵاتی تورکە. باری ئاشوب و ئاژاوەی پاشەکشەی ئینگلیز لە رانیە و سلێمانی و دەوروبەری، ئۆزدەمیری هاندا کە بەرنامەی پەیمانی میللی سەبارەت بە باشوری کوردستان بە شێخ قادر رابگەیەنێ:

**«لەبەر ئەوەی سەرپاکی ولایەتی موسڵ خراوەتە ناو پەیمانی میللی تورکەوە، هێزێکی ناپاکی وا بە بیرا نایەت لەناو سنورەکانی میللی ئێمە دا فەرمانڕەوایی بکا. تا ئیمرۆ لەشکرە گەورەکانی تورک لە بەرەکانی تردا خەریکی لەشکرەکانی دوژمن بوون، نەدەپرژانە سەر ئەم هەرێمانە، ئەوا بە یارمەتی یەزدان بەرەکانی رۆژئاوا لە دوژمن پاک کرایەوە، لەبەر ئەوە لەم کەلێژمێرەوە دەست دەکەین بە پاک کردنەوەی ئەم هەرێمە و پشت بەخوا زۆری پێ ناچێ هەر چی ناپاکێک هەیە لە کوردستان، لەگەڵ دوژمنەکان، پاکیان دەکەینەوە»**[٣٥].

لە کەرکوک، کۆمەڵەیەکی تورکی هەبوو، پیرۆپاگەندەی تورکایەتی لە کەرکوک بڵاودەکردەوە، ئەوانە نە بە دەسەڵاتی فەیسەلی عەرەبی رازی بوون نە بە دەسەڵاتی شێخ مەحمودی کورد[٣٦] ئەو کۆمەڵەیە ناوی «جمعیەتی مودافعی حقوق» بوو. ئۆزدەمیر پەیوەندی لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیە بەتین بوو. لە وەڵامی نامەیەکدا لە بارەی شێخ مەحمودەوە، ئۆزدەمیر دەنوسێ: «من لەگەڵ ئەوەشا کە بە شێخ محمود خۆی متمانەم هەیە باوەڕ ناکەم کە بیر لە خراپە بکاتەوە و یا بەرامبەر ئێمە دڵی گۆڕی بێ... زێتر لە راستی و دۆستایەتی بەرامبەر تورک دوانەکەوتوە. هەندێ بێ ئیشتمانی خەڵکی سلێمانی خەریکن تەفرەی بدەن و بیخەنە سەر بیری دوژمنایەتی لەگەڵ تورک[٣٧] شێخ محمود لە نێوان بەرداشی ئینگلیز و تورکەکان دا بوو. تەواو لە ئینگلیز بێ ئومێد ببوو، دەشی زانی تورک سەربەخۆیی بە کوردان نادەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ئامادەنەبوو. بەچۆکدا بێ، بۆیە بڕیاری دا جارێکی تر کە ئینگلیز شەڕی بەسەردا بسەپێنێ، بەرگری بکا و لە خەباتی عەسکەری و سیاسی و رۆشنبیری خۆی لە دەردەوەی سلێمانیش بەردەوام بێ. لە ناست هەڵوێستی

سێخ محمود -شەڕ نەکردن لەگەڵ نۆزدەمیر بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی کوردستان- لە ١٩٢٣/٢/٢٩ دوو فڕۆکەی بەریتانی هاتنە سەر سلێمانی، پڕیاسکەیەکیان فڕێ دا، دوو بۆمبایش بەدوایدا. لە ئاگاداری یەکە ئاوا نووسرابوو:

## اعلان بو شیخ محمود افندی

## و

## خلق سلیمانی

**خبرتان بیت کە اگر پێش نیمە ڕۆژی ڕۆژی یکشنبە بیست و پێنجم ام مانگە (مطابق بیست و یکم شوال) شیخ محمود افندی ل چمچمال یا لکرکوک دخالت بکات بومباردمان مرکزی سلیمانی اجراء ناکرێت بلام اگر حتی او وقتە دخالت نکات بومباردمانیکی شدید واقع دەبیت»[٣٨]**

شێخ محمود و خەڵکی سلێمانی چاوەڕێ بوون ئینگلیز بەیاننامەی ئازادی ڕابگەیەنێ، چونکە پێشتر هەر لەسەر ساڵی ١٩٢٣ هەردوو حکومەتی بەریتانیا وعێراق بەڵێنیان دابوو کە «حکومەتێکی کوردی» لەو شوێنانە دادەمەزرێنن کە لە سنوری باشوری کوردستان دایە[٣٩] شێخ محمود، دەیزانی بچێ بۆ بەغدا بۆ کورد هیچ بە هیچ ناکات هەروەها دەیزانی ئینگلیز جدی یە لە بۆمبارانکردنی سلێمانی دا، بۆیە بڕیاری دا ئاوەندی شار چۆڵ بکات. ئینگلیز سلێمانی لە ١٩٢٣/٣/٢ بۆمبارانکرد، نۆزدەمیریش لە ١٩٢٣/٤/٢٢ لە ڕەواندز کشایەوە. لەو هێرشەدا ئینگلیز توانی هەندێ لە سەرکردە عەشایری یەکانی وەک ڕەزا بەگ و عبدالرحمن پاشا -کە ئەدمۆندز بە «برادەرە کۆنەکانی خۆی» ناویان دەبا- لە دژی شێخ و نۆزدەمیر بەکاربێنێ[٤٠]. دەرچوونی شێخ لە سلێمانی و نۆزدەمیر لە ڕەواندز، لە ڕووی عەسکەری و سیاسی یەوە بە قازانجی شێخ شکایەوە، چونکە وەک ئەحمەد خواجە لە «چیم دی» بەرگی دووەم دەنووسێ «ئەو عەشایەرانەی کۆمەکی نۆزدەمیر یان کرد بوو لە سەدی (٧٠)ی گەڕایەوە بۆ ناو سوپاکەی کورد و لای شێخ محمود هەتا خودی نۆزدەمیریش لە نیسانی ١٩٢٣ بە (غفور خان) و سەرۆکێکی تری (ئاکۆ)دوە ئەم نامەیەی نارد بۆ شێخ محمود:

«دەستتان ماچ ئەكەم ئارەزووی بینینتانم هەیە چاوەڕێ ی فەرمانتانم - نۆزدەمیر»[٤١]

دوای چوار سەعات کۆبونەوە لە گەڵ نۆزدەمیر لە ئەشکەوتەکانی شێخ باخ، بریار درا کە ئۆزدەمیر لە کۆیە و رانیە دەکشێتەوە و دەچیتەوە (کانیە ردش). دەرکردنی نۆزدەمیر لە ناوچەکەدا یەکێ لەو مەرجە سەرەکیانە بوو، کە ئینگلیز داوای لە شێخ محمود دەکرد، بەلام پاش ئەوەی شێخ بە شێوەیەکی دبلۆماسی نۆزدەمیری ناچار کرد، ناوچەکە چۆڵ بکات، ئەوا ئینگلیز لەسەر کاری داگیرکارانەی خۆی هەر بەردەوام بوو تا لە ٢٨/ئایاری ١٩٢٣ بە یارمەتی هەندێ عەشایەری کوردی سلێمانی گرت. رۆژێ دواتر «عبدالمحسن السعدون»ی سەرۆک وەزیرانی عێراق بەیاوەی هەندێ ئەفەری راوێژکاری بەریتانی گەیشتە سلێمانی، هەر زوو کۆمیساری بالای نوێ ی ئینگلیز لە عێراق مستر هنری دوبس یش گەیشت[٤٢]

هەر پاش گرتنەوەی ردواندز، نۆزدەمیر پەیوەندی لەگەڵ هەکاری پچرا و خۆی لە بەردەم هەلویستێکی سەربازی حەساس دۆزیەوە، بۆیە پێجگە لە کشانەوە بەرەو ئیران هیچ چارەسەرێکی تری بۆ نەمایەوە. دەسەلاتدارانی ئێرانیش پاش ئەوەی نۆزدەمیر و میلیشیاکەیان چەک کرد ئەوجا رێیان پێدان بگەڕێنەوە تورکیا. نۆزدەمیر لە ١٩٢٣/٥/١ دا گەیشتە وان. ئەو پاشەکشەی نۆزدەمیر بۆ (وان) کۆتایی بە هەموو چالاکیەکانی تورکیا لە ناوچەکەدا هێنا[٤٣]. بەمجۆرە ئەو ئۆزدەمیرەی دەیەویست بەزەبری دبلۆماسیەتی خۆی و هێزی عەشایەری کوردی باشوری کوردستان لە «بێگانە» پاک بکاتەوە و بیلەکێنێ بە تورکیا لەبەردەم چەند هێرشێکی ئینگلیز دا بەچۆکدا هات. گرتنەوەی سلێمانی و نەمانی ئۆزدەمیر لە ناوچەکەدا، دەرفەتێکی لە باری بۆ هێزی داگیرکاری ئینگلیز و عەرەب رەخساند کە بیر لە لکاندنی هەموو ویلایەتی موسڵ بە عێراق عەرەبی بەوە بکەنەوە. لە ئاکام دەگەینە ئەم ئەنجامەی کە پرۆ پاکندەی کەمالی یەکان لە کوردستانی باکور و نۆزدەمیر لە باشور لە ماوەی ١٩١٨-١٩٢٣ هەر بۆ دەمکوتردنەوەو، و بێ دەنگ کردنی دەنگی بزاڤی ئەتەوایەتی کورد بووە[٤٤]

## ئەنجام:

لەم کورتە لێکۆڵینەوەیەدا ئەم ئەنجامە بەدەست هێنراون:

١- مێجەر نوئیل و نۆزدەمیر نوێنەری ئینگلیز و تورکیا بوونە بێجگە لە پەیڕەوکردنی سیاسەتی داگیرکارانەی ئینگلیز و تورکیا هیچ مەبەستێکی تریان نەبووە.

٢- نوئیل باوەڕی بە حوکمی ناڕاستەوخۆی بەریتانیا هەبوو لە کوردستان بەواتای کەسێکی وەک شێخ محمود بەرژەوەندی ئینگلیز لە ناوچەکەدا بپارێزێ. هەر کە ئاشکرابوو، کە شێخ (بەشێخاتی» و «ئاغایاتی» ڕازی نی یە دەیەوێ «سەرۆکێکی کورد» بێ خاوەن دەوڵەت بێ، ئەوا ئینگلیز لە «حوکمی ناڕاستەوخۆ» پەشیمان بوونەوە و حوکمی ڕاستەوخۆیان بە پەسەند زانی. هەر کە مێجەر سۆن -حاکمی سلێمانی نەیتوانی عەشایەری کوردی بە دەوری «دەسەڵاتەکەی» خۆی کۆبکاتەوە، لە ئاکامیش هەندێ عەشایەری کوردی بە لای تورک دا چوون. ئینگلیز ناچار بوو شێخ محمود بگەڕێنێتەوە. ئەمجارەش کە شێخ داوای «مەلیکایەتی» کرد، ئینگلیز بڕیاریان دا باشووری کوردستان بە عێراقی عەرەبی بلکێنێ. لە کۆنگرەی لۆزان بۆ ئەوەی ویلایەتی موسڵ لە کورد بسەنن، ئەوا ئینگلیز ژمارەی کوردی لەناوچەکەدا زۆر کەم کردەوە و ژمارەی عەرەبی لە خەمڵاندنی عەرەبەکان زیادتر کرد.

عەرەبەکانیش چاک دەیانزانی کە باشووری کوردستان بەشێک نی یە لە عێراق، بەڵام لە بەر هۆکاری نەوت و دەسەڵات و هەڕەشەی شیعەکانی باشووری عێراق، شان بەشانی ئینگلیز حەبێتیان کرد بۆ ئەوەی ویلایەتی موسڵ بکەنە بەشێک لە دەوڵەتەکەیان -عێراقی زۆرە ملێ. لەو قۆناغەدا ئاشوریەکانیش تەواو کەوتبوونە ژێر دیاگۆژیەتی بەریتانیا لەلایەک شەڕی کوردیان دەکرد، لە لایەکی تریشدا دەیانگوت موسڵ پایتەختی کۆنی ئاشوریەکانە، بۆیە دەبێ حکومەتێکی ئاشوری سەربەخۆ لە ویلایەتی موسڵ دابمەزرێ.

٣- کەمالی یەکان بزاڤێکی کۆلۆنیالی بوون. لە بنەڕەتدا بزاڤێکی «نادینی» بوون، بەڵام بەناوی دینەوە توانیان جێ پێ خۆیان لە باکور بکەنەوە. هەر کە تەواو کۆنترۆڵی باکور و تورکیا یان کرد لە ڕێگای باوەڕی «هەناردنە دەرەوەی شۆرش بۆ سنورەکانی پەیمانی میللی» کەردکیان بوو باشووریش بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

٤- نۆزدەمیر دەیەویست «کەمالیەت» لە باشور بڵاوبکاتەوە لەو ڕێگایەش دەست بکا بە کۆلۆنیاکردن و تورک کردنی ئەو بەشەی کوردستان. لە نامەکانی بۆ شێخ قادر و شێخ محمود تەواوی ستراتیژیەتی خۆی ڕوون کردۆتەوە.

٥- ڕازی بوونی نۆزدەمیر بە کشانەوە لە کوردستان ئەو کاتە بووە کە هێزەکەی تەواو لە ژێر فشاری عەسکەری ئینگلیز دا بوو. هەروەها زۆربەی ئەو عەشیرەتانەی پێ ی هەڵخەتابوون گەڕانەوە لای شێخ محمود -بەواتای ئەگەر ناچار نەبا لە کوردستان نەدەکشایەوە.

٦- تورکەکان لە پاش ئەمانی نۆزدەمیر لە باشور دەستبەرداری ئەو ناوچەیە نەبوون، بۆیە لە کۆنگرەی لۆزان بەبیانووی ئەوەی ویلایەتی موسڵ وڵاتی عەرەبان نی یە، ئەوا دەبێ بدرێتە

(٢٠) جەلال تەقی، خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقی دا، دا بەغدا ١٩٧٠، ل٥٦.
(٢١) سەرچاوەی (١٩)، ل١٤٦.
(٢٢) سەرچاوەی (١٦)، ل٢٧
(٢٣) سەرچاوەی (٩) هەروەها سەرچاوەی (١٦) و (١٧).
(٢٤) سەرچاوەی (١٦)، ب٢٥.
(٢٥) حلـلی حلیل وآحرون، الحرکة الکردیة فی العصر الحدیث، بیروت ١٩٩٢، ص١٢٧.
(٢٦) سەرچاوەی (٩)، ل٢٢: رەفیق حیلمی، لاپەرە ٣٢-٣٣ی بەشی دووەمی یاداشتەکانی دا لەو وەختەدا کە تورک و ئینگلیز خەریک بوونە مالی کوردیان ویران دەکرد. ئەو بەراشکاوی رەوشی رۆناکبیری وەک خۆیی و هەندێکی تر ئاوا باس دەکات: «من لەو دەمەدا... لەگەل ماجد مستەفا هاورێ ی مەکتەبم و تۆفیق وەهبی و هەندێ لە زابیە کوردەکانی تر تازە لە ئەستەمبوول هاتبوونەوە. ئەوان لە گەل ئەوانا کۆ ئەبوینەوە. زۆری کۆبونەوەکانمان لە مالی تۆفیق وەهبی رێ ئەکەوت. سەوانی دوورودرێژی زستانمان بەسکالا و باس و هەوالی ئەو رۆژە و بە خوێندنەوە و بەزم و سازندنەیی ئەبردە سەرە.
(٢٧) سەرچاوەی (١٩)، ل١١٦
(٢٨) بروانە: بێ رەش، ل٣: خواجە، ل١١٦: رەفیق حیلمی و لازاریف، ل٢٢١.
(٢٩) سەرچاوەی (٩)، ل٣١.
(٣٠) سەرچاوەی (٢)، ل١٥٧
(٣١) سەرچاوەی (١٥)، ل١٢٠: هەروەها (٢) ل ١٥٧
(٣٢) سەرچاوەی (٢)، ل٢٠٤
(٣٣) سەرچاوەی (١٦)، ل٥٩٩.
(٣٤) سەرچاوەی پێشوو ٥٦٥: هەروەها سەرچاوەی (٢)، ل٢٠٢.
(٣٥) سەرچاوەی پێشوو
(٣٦) سەرچاوەی (٨)، ل١٦
(٣٧) سەرچاوەی (١٦)، ل ٦١٠-٦١١.
(٣٨) سەرچاوەی (١٧)، ل١٤٧-١٤٨.
(٣٩) زۆربەی سەرچاوەکان دەقی ئەو بەیاننامەیان بلاوکردۆتەوە.
(٤٠) سەرچاوەی (١١)، ل٢٣٠.
(٤١) سەرچاوەی (١٧)، ل١٦
(٤٢) سەرچاوەی (٤)، ل٢٣٠
(٤٣) سەرچاوەی (٨)، ل٤٧.
(٤٤) شاکر خصباك، الکرد والمسألة الکردیة، بغداد ١٩٨٩، ص٤١.

## پێش ئەوەی ئینگلیز دەولەتی عێراقدامەزرێنێ حکومەتێکی کوردی لەسلمانی دامەزاند

لەگەرمەی شەری یەکەمی جیهاندا بەریتانیاو فەرەنسا لە رێگای سایکس وبیکو وە نەخشەیەکیان دارشت بۆ دابەش کردنی دەولەتی عوسمانی. بەحوکمی بالادەست بوونی روسیا لە ناوچەکەدا ئەواهەریەك لە(سایکس ) و(بیکو) توانیان (سازانوف) ی رومیش رازی بکەن بە بیروکەی نەو پرۆژەیە ئەو پرۆژە ئیستعماریە لە مێژوودا بەپەیمانی سایکس بیکو ناسراوە. بەگویرەی پەیمانی سایکس بیکۆنەوا ـ سەبارەت بەعێراقی ئەمرۆ ـ باشوروناوەراستی عێراق بۆ ئینگلیز دانرا بورن هەرچی ویلایەتی موسل یاخود خواروی کوردستان بور ئەوابۆ فەرەنسا دانرابو. بەلام کەئینگلیز بەتەواوی باشورو ناوەراستی عێراقی داگیر کرد هەروەها هەندێ لە خواروی کوردستانی داگیر کردو هەتا گەیشتە ئەوەی لە ١١١٨ ١٩١٨ بەواتای دوای ئاگربەس مۆدوروس ٣٠١٠\١٩١٨ موسلی داگیر کرد ئەوا مەرامی خۆی لەودا گیرکردنە ئاشکرا کرد.

ئەمەو ئینگلیز هەر پێش پەیمانی سایکس بیکۆش بیری لەوە کردۆتەوە کە دەست بەسەر هەر ناو چەیەکدا بگرێ کەنەوتی هەبێ ، ئەوەتە چرچل هەر لەسالی ١٩١٣ وتویەتی: دەبێ بین بە خاوەن ئەوت یان هەرهیچ نەبێ دەبێ کۆنترۆلی ئوەندە ئەوتە بکەین کە دەمانەوێ بونی ئەوت لە ناوچەکەدا وای لە ئینگلیز کرد کە بیر لەوە بکاتەوە فەرەنسای هاو پەیمانی رازی بکات و واز لە ویلایەتی موسل بێنی. هەر لەو پێوەدانگەوە لە گۆنگرەی سان ریمۆ( لوئیدجۆرج ) ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا توانی ( کلیمە نسۆ)ی سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا رازی بکات واز لە موسل بێنێ ئەوسا کلیمانسۆ نرخی ئەوەی نەدەزانی کە بە بەریتانیای دابوو، بەلام کە زانی لە دەست دانی ویلایەتی موسل زیانێکی زۆر گەورە یە بۆ بەرژەوەندیە کانی فەرەنسا ئەواله ٢٢\ مایسی ١٩١٩\ بە لوئید جۆرجی وت: ئەگەر بمانزانیابا ئەوشتە ئەوەندە بە نرخە ئەوا قەت دەست بەرداری نەدەبوروم

بەم جۆرە ئینگلیزبە رەسمی حوکم کردنی هەرسێ ویلایەتی بەسرا و بەغدا و موسلی بۆ خۆی فۆرخ کرد، پێکهاتەی قەومی و مەزهەبی ئەوسێ ویلایەتە تەواو ئینگلیزی هەراسان کردبوو. سەرەتا ئینگلیز بە ناچاری بیری لەحوکم کردنی ناراستەو خۆ کردەوە ، ئەو جۆرە ئیزامەی کاتی

خۆی لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و میرەکانی کورد پەیڕەو دەکرد. [illegible]
نزیکەی سێ سەد ساڵ دەوڵەت و میرەکان بێ شەڕ بوون لەگەڵ یەك . لێرەدا دەمێ سەرنجی ئەوە بدەین کە شێخ مەحمود پێش ئەوەی ئینگلیز کەرکوك داگیر بکەن نامەی بۆ سەرانی ئینگلیزی ناردووەو داوای کردوە کەئەو بۆ حوکمداری کوردستان بناسن.

ئەمەش بەڵگەیەکی کۆنکریەتییە کەشێخ خۆی داوای لەئینگلیز کردووە کە بە ڕاسپاردەی ئەوان بێ ئەحوکم دارێنەك بانگاشەیەی جاران باو بوو کە گوایە شێخ تۆقەی لەگەڵ ئینگلیزنە کردوە ، چونگە ئەوان کافربوون ! لە بەرامبەر ئەوە دا ویلسن خۆی لە یەکی دیسەمبەری١٩١٨ دا چوو بۆ سلێمانیو چاوی بەشێخ و سەرۆك عەشیرەت و پیاو ماقوڵانی ناوچەکە کەوت . لەپاش ئەو دیدارە ویلسن شاندێکی بەسەرۆکایەتی مێجەر نوئێل نارده سلێمانی بۆ ئەوەی ئیدارەیەکی کوردی بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمود دابمەزرێنێ نوئێل بەزمانی فارسی لەبەردەم خەڵکی سلێمانی دانی بە حوکمدار بەتی شێخ مەحمود دانا.

ئەو دەمەی ئینگلیز شێخ مەحمودی کردە حاکمی کوردستان ئەوا میر فەیسەڵ نەك هەر لە عێراق نەبوو بەڵکو حاکمی سوریا بوو. میر فەیسەڵ لە ١٩١٨\١٠\٢٢ هەتا ١٩٢٠\٧\٢٥ مسەلەکەتێکی لە سوریا دامەزراند بوو ، هیچ گرینگی بە عێراق نەدەدا هەتا هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن کە خۆی نیەتی باشی بە خەڵکی عێراق نەبووە بەڵام هەرکە فەرەنسیەکان لە سوریا دەریان کرد ئەوا ئینگلیز پێشتر چونکە شەریف حسێن پشتگیری ئینگلیز ی کردبوو لە دژی عوسمانیەکان ئەوا بەڵێنی ئەوەی دابوێ کە بیکا بەمیری هەردوو ویلایەتی بەسرا و بەغدا

هەرکە ئینگلیز جێی پێی خۆی لەناوچەکە قایم کرد بەبیانوی ئەوەی شێخ مەحمود پێی لە بەڕی خۆی زیاتر ڕاکێشاوە ، ئەوا بیریان لەوە کردەوە کەهەموو ناوچەکە لەژێر حوکمی ڕاستەو خۆی ئینگلیز دابێ نەك ناراستەو خۆ هەرچی شێخ بوو وارەفاری دەکرد کە حوکمداری هەموو کوردستانە بەتایبەتی خواروی کوردستان ، بەڵام ئینگلیز بە چاوی شێخ سەرۆك عەشیرەت تەماشای شێخی دەکرد، ئەمە وای کرد بەرژەوەندی ئینگلیز و شێخ دژ بەیەك بوەستن . لە ئاکامدا شێخ لە ئایاری ١٩١٩ لە دژی ئینگلیز ڕاپەری بەڵام لە حوزەیرانی ١٩١٩ دا ڕاپەرینەکە سەرکوت کراو شێخیش لە کۆتایی بۆهیندستان دوور خرایەوە. لەبەشە عەرەبیەکەی عێراقیش دا ئەو عەرەبانەی بە مەزهەبی شیعەن ، چوار قاتی عەرەبەکانی ناوەندی عێراق پێکدێنن ئەو

شیعانەش دەگەل ئیرانیەکان هاو مەزهەب بوون ، هەروەها ئەوەکەیی دەوڵەتی تورکی لەدژی عیراق کە لە حوزەیرانی ١٩٢٠ دا لەدژی ئینگلیز بەرپابوو ، ئەوە خۆی لە خۆیدا شەری شیعەکان بوو لە دژی ئینگلیز ئەو عەرەبانەی بە مەزهەب سوننەن ئەوا تەنها لە ١٥٪ ی عیراقیان پێکدەهیناو کوردەکانیش ٢٨٪ عیراقیان پێکدەهینا ، بۆیە هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن کە ئینگلیز وەك پاڵپشتێك بۆ عەرەبەکانی ناوەراستی عیراق ـ کەگوی رایەڵی ئینگلیز بوون ـ ولاتی کوردانی کردە بەشێك لە عیراق بۆ ئەوەی هاوسەنگی شیعە لە عیراقدا بەرامبەر سونەکان بی هەروەها بە حوکمی ئەوەی ئینگلیز ئومیدیکی زۆری بە نەوتی عیراق هەبوو ـ بە کوردستانیشەوە ـ ئەوە هۆکاری نەوت پالی بە کەسیکی وەك چەرچل ناوە کەبیر لەوە بکاتەوە هەرسی ویلایەتی بەسرا و بەغدا و موسل لە دەولەتیکدا کۆ بکاتەوە سەبارەت بە کوردان ئەوا ئینگلیز پاش دامرکاندنەوەی راپەرینەکەی شیخ مەحمود ، بە جدی بیری لەوە کردەوە کە راستەوخۆ حوکمی ناوچەکە بکات هەر بۆیە میجەر سۆنی کردە حاکمی سلیمانی و ئەدمۆندی کردە حاکمی کەرکوك و کاپتن های کردە حاکمی هەولیر و کۆلۆنیل لیجمانی کردە حاکمی موسل . بەمەش زیاتر میجەرسۆن بۆ ئەوەی کاریگەری شیخ مەحمود لەسەر ردوتی رووداوەکان لەلای کوردان لاواز بکات ئەوا ((پیشکەوتنی )) دەرکردو روناکبیرانی لەوبلاو کرایەوەنزیك کردنوە وەك وتمان شۆرشی شیعەکانیشی دەمکوت کرد جا بۆیە لە حاکمیك دەکەرا کە حوکمی هەرسی ویلایەت بکات لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ دا کۆمیساری بالا لە بەغدا داوای لە عەبدولرەحمانی نەقیبی پیاو ماقولی بەغدا کرد کە حوکمەتیکی عەرەبی لەژیر راسپاردەی بەریتانیا دا بمەزرینی . دامەزراندنی ئەو حوکومەتەش خۆی لەخۆیدا سەرەتایەك بوو بۆ لکاندنی خوارووی کوردستان بەو حوکمەتەوە .بۆ مەیسەربونی ئەو پرۆسیەش ئینگلیز لەمیریکی عەرەبی (سۆنی) دەگەرا .

لەو بارەوەیە وە چەرچل بۆ حوکمەتی لەندەن دەنوسی کە ئەو دەگەل میر فەیسەلی کوری شەریف حوسین وتوویژی کردوە و توانیویەتی میر فەیسەل رازی بکات کەببی بە پادشای عیراق ئینگلیز وای بی چاك بووکە بۆکاریکی واکۆنگرە یەك لە قاهیرە بەستری ئەوەبوو لە ١٩٢١\٣\١٢ دا بەشداری چل کەسایەتی یاخود چەرچل واتەنی (چل دز) کۆنگرەیەك لە قاهیرە سازدا

کار نامەی قاهیرە ئەم بابەتانەی خوارەوە بوو

١- کەم کردنەوەی خەرجی بەریتانیای گەورە لەعیراق .

٢- باسی ئەوانەی خۆیان بۆتەختی پاشای عیراق پالاوتوە

٣- مەسەلەی کورد.

٤- لەشکری داهاتوی عیراق بریاردراکەبۆ بەپادشاکردنی میرفەیسەل راپرسیەك لەسەرتاسەری هەرسی ولات بکری . کوردەکانی سولیمانی بەشداری ئەو دەنگدانەیان نەکرد لەکەرکوك (٢٠) مەزبەتە دەنگیان بە میرفەیسەل دا بەلام (٢١) دژی بوون کوردەکانی کەرکوك دەیانویست حوکمەتیکی کوردی دابمەزری بەلام هەندی خانەوادەی کەرکوکی کەخۆیان بە تورکمان دەزانی ئەوا نە بە میر فەیسەل رازی بوون وەنە بە حاکمیکی کوردی.

هەردوو لیوای هەولیر و موسل ئەوا بەمەر جەوە دەنگیان بەمیر فەیسەل دا . مەرجەکانیش اراستنی کوردو کەمینەکان بوو هەروەها بەهۆی بونی کەماسیەکان لە رواندز و رانیە ئەوا ئەو ـوي نانە بەشداری ئەو دەنگدانە یان نەکرد

پاش ئەوەی لە٩٦٪ دەنگەکان بە پادشایەتی میر فەیسەل رازی بوون ئەوا لۆرانس عەرەب ـمیر فەیسلی راگەیاند کەئەو دەبی بەپاشای عیراق و لەناکاو میر فەیسەل بەپاپۆری بەریتانی BrooNorthلە ١٩٢١\٦\٢٣ دا گەیشتە بەسراو ، لە١٩٢١\٦\٢٩ گەیشتە بەغدا ، ـە١٩٢١\٧\١٥ دا ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق دەنگیان بەمیر فەیسەل دا ، پاش ئەوەی میر فەیسەل ـازی بوو کە عیراق ببی بە حوکمەتیکی نیابی دیموکراتی و دەستوری ئەوا لە٢٣ی ئابی ١٩٢١ دا ـاجی پاشایەتی لە شاپلۆغانیکی رەسمیدا لەسەری میرفەیسەل نراو ناکام عیراق بوو بەدەو لەتیك ـەلیکی لەپاشان پاش مشتو مریکی زۆر لە کۆنگرەی لۆزان و کۆمەلەی گەلان ،بەزەبری بالادەست ـۆنی ئینگلیز کۆمەلەی گەلان لە ١٩٢٥دا بریاری لکاندنی خواروی کوردستانی بەعیراقەوە داو ـرەسمی لە١٩٢٦\٧\١٨ هیلی بروکسل بووە سنوری جیاکەرەوە ی تورکیا و عیراق ، بەلام هەر ـزئەوەی ئینگلیز جیی پیی لە ناوچەکەدا هەربینی پاش بریاری لکاندنەکە دوو مەرجی لەگەل ـریارەکەدانا:

١- عیراق بۆماوەی ٢٥سال لەژیر ئینتیداب بی .

٢- دەبێ ویست و ئارەزووی کوردان لە بەرچاو بگیرێ زمانی کوردی رەسمی بێ لەدادگاو قوتابخانەکان.

هەر چەندەسەرۆك وەزیرانی عیراقی ئەوسا لە وتەیەکداوتی  دەبێ مافی کوردان بدەین فەرمانبەر لەخۆیان لەناوچەی خۆیان دابمەزرێنین و دەبێ زمانیان ببێتەزمانێکی رەسمی وەدەبێ منداڵەکانیان لەقوتابخانەکانیان بە زمانی خۆیان بخوێنن ،لەسەردەمی پاشایەتی دا مافەکانی کوردبریتیبوون لە دامەزراندنی لەدام ودەزگاکان و خوێندنی بەزمانی کوردی لەهەندی شوێن هەروەها کورد نوێنەری هەبوو لەپەرلەمانی عیراقیدا ، زۆر جار وەزیری کوردیش لەوەزارەتەك لەدوایەکانی عیراق داهەبوو هێمنی وئاسایش ئارادەیەك بەرقەراربوو  بەلام هەڵویستی دەوڵەت لەبەرامبەر مەسەلەی کوردا ئەوا  هیچ گۆرانێکی بەخۆوە نەدی وئەوان کوردیان بەهاولاتیپلەدوو دەزانی ئامادە نەبوون بە شێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەری مەسەلەی کورد بکەن ، بۆیە  هەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقەوە شێخ مەحمودو شێخ ئەحمەدی بارزانی و مەلا مستەفا ی بارزانی لە پێناو دابین کردنی  مافەکانی کورد  راپەریوەن

بۆئەم بوسەتەمەماشای ئەم سەرچاوانە کراون

١-  د. حامدمحمود عیسی المشکلة الکوردیة فی الشرق الاوسط ـ مصر ١٩٩٢

٢-  بیت شرنیل الاشوررون فی المؤ الصلح باریس ١٩١٩ ـ دهوك ٢٠٠٠.

٣-  سەلام ناوخۆش هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسل ـ هەولیر ٢٠٠٠

٤-  گۆڤاری الملف العراقی العدد(١٠٤) ئاب ٢٠٠.

# ناوەرۆک